زنجیرەی ناودارانی ئیسلام

(٣)

# ئیمامی رەببانی

نوێخواز و فەیلەسوفی هەزاری دووەم

ئازاد رەئووف قەزاز

زنجیرەی ناودارانی ئیسلام
( ٣ )

# ئیمامی ڕەببانی

## نوێخواز و فەیلەسوفی هەزاری دووەم

ئازاد ڕەئووف قەزاز

---

چاپخانەی الحوادث

بغداد - ١٩٨٨

بە ڕەوشتی جوانو ئاکارت دوژمنەکەت لە ناخەوە بڕوخێنە
لە سەر وێرانەی دلی لەو گۆشکەکەی خۆت بچەسپێنە
( انما بعثت ... )(١) بەم خەلکە ساوایە بناسێنە

---

(١) مەبەست لەو فەرمودەیەی پێغەمبەرە کە دەفەرموێ « انمـــا بعثت لأتمم مكارم الأخلاق » ..

# وتەی مامۆستا عومەر ڕێشاوی

شاراوە نی‌یە ، نوسین لـــە بارەی ناودارانو خوالماتی جیهـــانی ئیسلامو ، ناساندنیان کارێـکی باشو فرمانێکی پیرۆزو مەزنە ؛ چونـکە وەك دەڵێن ( زکری صالحان ڕەحمەتی وا بێ ••• یاخود لـــە زکری صالحان ڕەحمەت دەبارێ ) ••• هەروەها مێژووی ئاینی ئیـسلام پڕو ڕازاوەیە بەو گـەورە پـیـاوە ناودارانەی کـە هەر یەکە لە ســەر دەمی خۆیاندا ســەر مەشقێکی چاکو ، چاو لێکردنێکی زینـدوو مەزنیان تێـدا بووە بۆ دەوروبەری خۆیانو ، بوونەتە چرایەکی شەوقدارو لەبەردەم ڕۆڵەکانی ئەو چەرخەدا ڕێـگای ئاینی نلیو ، خواپەرستی‌یان لە شـەوە زەنگو گیروگرفتی ئەو سەردەمەدا بۆ ئاشکراو ڕۆشن بووەتەوە •••

ئیمامی ( ربانی ) یەکێکە لەو پیاوە ناودارانەی کە لە سەرانسەری ناوچەکانی ولاتی ئیـسلامدا دەناسرێتو بەســەر زمانی خەڵکیەوە بەســە هەموو ڕێزو مەزنیەکەوە ناوی دەهێنرێ •••

خۆ یەکێ لەو ناوچانەش کوردوسـتانی ئێمەیە ••• لەگەڵ ئەوەشدا بە زمانی کوردی نوسینێك لەم بارەیەوە نی‌یەو ، بەرهەم نەهاتووە •

ئەم نوسراوەی کاك ئازاد قەزاز فەریـکە بەرهەمێکی باشە بۆ ئەم

مەبەستەو هیوای لێ دەکرێ بێتە هۆی بەرهەم هێنانی گەلێ بەرهەمی نوێ واچاکو فراوانتر لەم بارەیەوە ...

بە سوود بەختی دەزانم کە بڵێم :

نوسەر سەرەڕای گرنگی باسەکەی و ڕەوانبێژی لێ دوانەکەی دوو خاڵی نایابی خرۆشاندووە :ـ

یەکەم : مێژووی ڕەنگینو فراوانی نێوان ئێستای ئێمەو سەردەمی ( صحابەی کرام ) خوایان لێ ڕازی بێ بۆچی بەوردی نەناسرێتو سودی تایبەتی خۆی لێ وەرنەگیرێ ، کە زۆتر پێمان دەشێتو ، لە کالای بالای ئێمەوە نزیك ترەو ، ئاسانتر بۆمان دەگونجێ ...

دووەم زاراوەی ( تجدید ومجدد ) هەمتی ئیداعو داهێنانی لە جیهانی موسلمانانەدا وەها هەڵمزیوە ، کە ئیتر بە کارێکی جیاو سەربەخۆ نالسرێتو هەستی پێ ناکرێ ...

جیا ئەم یەکخستەی کاك ئازاد لە نێوان داهێنان بە زاراوەی ئێستاو ( نوێ کاری) بە زاراوەی ئیسلام ، وەك كاك ئازاد دەیلێ لە دەزفەتی هەستێکی بزوێنەرو بیرکردنەوەیەکی هوشیارانەدا خاڵێکی بایەخدارو بیرکردنەوەیەکی پەسەندو پرشنگدارە . لە کۆتاییدا : هیوام سەرکەوتنو زۆر بونی وێنەیەتی .

عومەر ڕێشاوی

# وتەی مامۆستا عابدین رشید :

لە توێژینەوەی پیاوانی ناودار ـ چ سوودێك وەردەگرین ؟
بەبێ جەنەو چوون ، دیراسەکردنی ئەو پیاوانەی ناودارانو لە گشت
لایەنەکانی ژیان شارەزانو ، لە زۆربەی بوارەکانیدا دەرکەوتوون ،
کەڵكو سوودێکی بەرفراوانی هەیە ، بەڵکو هەندێك جار دەگاتە ئەو
ڕادەیەی کە بکرێن بە ڕێباز ، بۆ دۆزینەوەی چاکترینو ڕێكو
پێکترینو کورترینو سەرکەوتوترین ڕێگا بۆ گەیشتن بە ئامانجی
بڵندو پڕ بایەخ ٠

بێ گومان لێکۆڵینەوەی ژیانی پێغەمبەری مەزن لە پێشەنگی
ئەمانە هەموویانەوەیە ، پاشان ژیانی ئالو ئەصحابو تابیعین لە ڕووی
گرنگی مێژوویی یەوە یەك لە دوای یەك دێن ، تاوەکو زنجیرەی
ڕەسەنی ژیانیان نەوە لە دوای نەوە یەك بگرنو ، یەك بە دوای یەکدا
بێن ، بۆ ڕۆشن کردنەوەی ڕێگای موسڵمانانی پاش خۆیان ٠٠ ئەمەیش
یاسایەکە لە یاساکانی پەروەردگار بۆ گەلی ئیسلام ٠٠

لێرەوە گرنگی دیراسەکردنی پیاوە مەزنەکانی مێژووی ئیسلام ،
بۆ ڕۆژگاری ئیمڕۆمان دەست پێ دەکات ، لەو ڕوانگەیەوە کە واقیعی

ئێمڕۆی موسڵمانو ، ئەو قۆناغەی پێدا دەڕوا ، داخوازی ئەمە دەکات، چونکە دوژمنانی لە هەموو لایەکەوە سەریان تێناوە .

بەڵێ ، هەرکاتێ کەسێك خۆی یان منداڵەکەی نەخۆش بکەوێ ، ڕوو لە پزیشکێکی زانای لێهاتوو دەکات تلوەکو چارەسەری بکات..
بەڵام ئەگەر هاتوو گەلێك نەخۆش کەوتو ، ئەوا خەریکە بە تەواوەتی لە بەرابەری گیروگرفتی زیاندا دەکەوێ ، ڕوو لە کوێ بکات ؟ ڕوو لە کێ بکات ؟ ئایا ڕوو لە پزیشکێکی مرۆڤانەی دەست پاکو ، پسپۆڕانی زیرەك ناکات ؟

بەم چەشنە ویستی خوا وایە کە لە هەموو سەدەیەکدا ـ پاش دوامین پێغەمبەر ـ کەسانی وا بنێرێ بەهۆی ئەو گیانە بلیمەتەو ، عەقڵە عەبقەرییەی پێیان دەبەخشێ ، دەردی ئەو چەرخە بدۆزنەوەو برینەکەی سارێژ بکەنو ، بەرەو ئاسۆی ڕووناکیو ، دەروون بەرزیو ئیمانێکی نوێی بەرنەوە هەروەکو ئەستێرە وان ، کاروانی مرۆڤایەتی لە تاریکستانی شەوەزەنگدا ڕێگایان بۆ دەدۆزنەوە ، بەڕاستی ئەمانەن جێگری پێغەمبەران ، ئەو پێشەوا نەمرانەی خوای گەورە بە ڕەحمەتو حیکمەتی خۆی هەڵیبژاردون ، بۆ نوێ کردنەوەی پەیامی مەزنی ئیسلام .

با ئێستاش ئەم پرسیارە لە خۆمان بکەین : لە دیراسەکردنی ئەم پیاوە مەزنانە ، چ سودێك یا ڕێنیشاندانێکمان ، دەست دەکەوێت ؟
یەکەم شتێك کە بە مێشکی مندا دێت ـ هەروەك هەمان شت بە مێشکی موسڵمانانی ئەم سەردەمەدا دێت ـ بە تایبەتی کە ئێمە واین لە دوا دوای سەدەی بیستەمدا ، ئەوەیە کە زانست یەکەم داخوازییە بۆ خۆ مولەمەند کردن ، تابگەینە کاروانی شارستانیەتیو تەکەلۆژی نوێ ،

ئەوەش جێگای سەرسوڕمان نیە ، چونکە قورئانی پیرۆز لە یەکەم ساتی هاتنەخوارەوەیدا ، لە ئەشکەوتی (حراء)دا ئەمەی ئاشکرا کردووە ، تاوەکو مەزنترین مرۆڤ لە وجودا بە وشەی ( اقرأ ) تەڵقین بداتو ، دەروازەکانی جیهانی زانست ، تا ڕۆژی دوایی بخاتە سەرپشت . بەڕاستی چەرخی زانست ، وا هاتو ئەوەش سەدای سروشتی یەکەمە لە گشت لایەکی بوونەوەرە پانو بەرینەکەدا دەنگ دەداتەوەو ، بانگمان دەکات بۆ ئەو پێش برکێ مەزنەی لە نێوان گەلاندا دەکرێ لە بواری زانینو زانستو هونەردا .

ئەوەی ڕاستی بێت لە گەردوندا دەنگێك نیە بگاتە دەنگی ئیسلام لە بانگەوازیەکەیدا ، بۆ خۆشەویستی زانستو بەچاکی زانینی زانیاریو گرنگی فێربوون ، سەرەڕای ئەو هەموو بەربەستو گیرو گرفتو خەفەکردنەی هاتونەتە ڕێگای .. بە ڕاستی ئەو کەسە ڕاستی وتووە کە دەڵێ : ئەم ئاینە چ ئاینێکە ئەگەر پیاوی خۆی هەبێت !

دووەم شتێك کە ئەویش لە ئاستی زانستدایە ـ ئەگەر نەڵێم لەو زیاترەبریتی‌یە لە ( ڕەوشتی جوان ) باوەڕ ناکەم هیچ پێویست بکات کە نرخو بەهای ئەم لایەنە باس بکەم ، مەگەر تەنها ئەو هەڵوێستەتان یاد خەمەوە کە چۆن قورئانی پیرۆز حەقیقەتی بەرزیو پایە بڵندی پێغەمبەری پێ دەرخستووە ، بە تاجی ئایەتی ( وانك لعلى خلق عظيم ) ڕەنگینی کردووە ..

بە پلەی سێ‌یەم ئەو پەیوەندی‌یە پڕ لە خۆشەویستی‌یە دێت ، کە لە نێوان مرۆڤو پەروەردگاریدا بە نوێژو ڕۆژوو گرتنو زەکات دان دادەمەزرێت کە هەر یەکێکیان پایەیەکی مەزنی ئیسلامنو ، هیچ دژواریەکیان لەگەڵ ڕاستی‌یەکانی زانستو پیرۆزی ڕەوشت تێمدا

دیرناکەوێت .

جا ئەگەر ئێمە دەرسی خۆمان لە قوتابخانە مەزنەکەی زیان وەرگرتو ، بە چاکی لێی تێ گەیشتین و ، بە باوەڕو کردەوەو دڵسۆزی ، مافی خۆیمان دایێ ، ئەوە دەگەینێ کە بابەتی مێژووی پڕلو چاکانی پێشواتمان بە چاکی وەرگرتووە ، تا وەکو بێت بە مەشخەڵێکی نوێی بەکەڵك ، بۆ ئێمەو پاش خۆمان .. هیچ جەشنە خێرێك لەمو کۆمەڵە ڕەچاو ناکرێت ئەگەر بێتو ڕێنیشاندان لە ڕابوازدووانی خۆی وەرنەگرێت ، ئەوەیش بە زیندووکردنەوەی پیاوە مەزنەکانی و ، بڵاوکردنەوەی بەهاترین کەلەپوریان ، بە هوشیاری و دڵسۆزییەوە دەبێت ، بۆ دروستکردنی بنایەکی توندو پتەو ، بۆ کاتی ئێستاو ، دابینکردنو دڵ ئارامی بۆ داهاتووی ، بۆ ئەم کارەش هەموو توانایەکی بخاتە کارو ، گشت وزەیەکی خێری بتەقێنێتەوەو ، هێزی پیرۆزی لە خۆیدا دەربپەڕێنێ ، لە پێناوی گەیشتن بە ڕەزامەندی پەروەردگاری .

پاشان بە خوێنەری بەڕێز دەڵێم ـ هەروەکو من بۆی دەچم ـ بەزیادە ڕەوی نازانم ئەگەر بڵێم : پاش ئەوەی ئەم کتێبە بە ورخەم چەند جارێك خوێندەوە ، کە باسی زیانی ئیمامی ئەحمەدی سەرهەندی دەکات ـ ناسراو بە نوێخوازی هەزاری دووەم ـ شوێنەوارێکی گەورەو قوڵی زانستو ڕۆحو ڕەوشتم تێدا بەدی کرد ، بەدوریشی نازانم تۆش بگەیتە ئەوەی من پێی گەیشتوم ، دوو توێی کتێبەکە ـ بەڕای خۆم ـ سەرکەوتوترین بەرنامەی گەیشتن بە پەروەردگاری لە سەر ڕێو شوێنی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ، لە ڕێنگەی نیقهێکی کارامەو ، ڕۆحێکی پڕ لە تێکۆشانو بەرنامەیەکی ڕاستو ڕەوان ، گرتوتە خۆی .

کاتێ کە بیرەوەری بوێنخوازانی مەزن هەڵدەدەینەوە ، بە پێی زنجیرەی سەردەمیانو بەپێی تێپەڕبونی مێژووی پیرۆزیان ، دەبینین ئیمامی سەرهەندی لە چلە پۆپەی فتوحاتی مەعنەوی تەمری فیکریو ڕۆحیو کەسێتی یە لە جیهانی جیهادی پڕ لە شکۆدا وەستاوە ، ئەمەش بە هۆی ئەو هەڵوێستە ڕەنگینانەی بواندویەتیو ئەو یەقینە پڕ لە تینەی بوویەتیو ئەو قارەمانێتی یەی دەری خستووە .. ئەمەیە وا دەکات کە ژیانی ئەمیشو ئەوانەیشی وەکو ئەم وان دیراسە بکرێنو بە پێی داخوازی ئەو سەردەمەی تیایدا ژیاون بە قوڵیو فراوانی شی بکرێنەوە .

ئەمە بێ هەڵەیو دەتوانرێ ، ئەم پیاوە لە سەردەمی خۆیدا بە نەجیبترین قوتابی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دادەنرێت ، کە عینایەتی خوایی بوو فرمانی نوێکاری سەبارەت بە ئاینەکەی پێ سپارد ، پاش ئەوەی خەریك بوو لە کیشوەری هیندستاندا ، لە بەردەم زەبرو زەنگی گومڕایی و ستەمکاراندا ، بە تەواوەتی مەعالمەکانی پێشێل دەکرانو شوێنەوارەکانی دەسڕانەوە ، کە خراپترین چەکی ڕاگەیاندنی دەجالانە لەو کاتەدا یارمەتی دەدا ، سەرەڕای دەزگای ستەمکاری کوشتنو بڕینو لەناوبردن . ئیمامیش هەروەکو پاڵەوان بەم ئەرکەی سەر شانی هەڵساو توانی ڕێڕەوی ئەو ڕۆژگارە ڕەشو قیناوی یە ترسناکە لە مێژوودا بگۆڕێ ، ئەویش بە شکاندنی پشتی لایەنە خراپەکەی فەلسەفەو قەڵاچۆکردنی مەترسی زەندیقەکانی سەردەم ، ئەو کەسانەی کە بەرگی ئاینێکی نوێیان لەبەر خۆیان کرد بوو ، کە بریتی بوو لە ئارەزووی پاشاکانیان . هەروەکو برا نوێخوازەکانی پێش خۆی لەبەرە بەیانی هەڵهاتنی سەدەی یەکەمەوە ، لە مێژووی ئیسلامو موسڵمانان ئەو سەردەمەی لە تاریکی یەوە گۆڕی بۆ ڕوناکیو،لە لێشاوی لافاوی کوفرەوە

هێنایەوە بەر ڕۆخی ئیمان ، لە کۆتاییدا لە یەزدانی مەزن داواکارم ، هەنگاوەکانی لاوی نوسەری ئەم کتێبە پارێزێ و ، پاداشتی چاکەی بداتەوە ، کە تێکۆشاوەو ماندوو بووە ، لە پێناوی هێنانە بوونی کتێبی سێیەمی ئەم زنجیرەیە لە پێلوانی زانست و ئیمان و ڕەوشت ، هیوادارین بە ژیانی پیاوێکی مەزنی تری ئوممەتی ئیسلام دڵخۆشمان بکات ، کە کانگای خێرو چاکەو پاڵەوانێتی و جوانییەو ، تا ژیان ماوێت سەرچاوەی پیاوچاکان و بلیمەتان و پاڵەوانانە .

عابدین ڕەشید

## وتەی دکتۆر دلشاد قەرەداغی :

بانگکەرانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەر لە سەرەتاوە چەند شەقڵێکی جیاوازیان لە شێوازو جۆری بانگردنەکەیان پێوە دیار بوو ، ئەمەش لە سێ دووری سەردەم و شوێن و بانگکەرەکە خۆیدا کۆ بووبۆوە . ئەو شێوازە لە شوێن و سەردەمێکەوە دەگۆڕێ بۆ شوێن و سەردەمێکی تر ، یان لە هەمان شوێن و سەردەمدا شێوەی جیاواز جیاواز بەدی دەکرا ، هەروەها بانگکەرەکە بە پێی هەڵکەوتنی سایکۆلۆژی خۆی شێوەی بانگەوازی جیاوازی هەبوو لە یەکێکی تر ، یان هەمان کەس بە درێژایی تەمەنی بانگەوازەکەی شێوەو ئوسلوبی جۆراو جۆری بەکار دەهێنا . بەڵام دەبێ چاك ئەوە بزانین کە هەرگیز بە موو لە مەبەستە سەرەکیەکە کە خوا لەخۆ ڕازیکردنە لایان نەداوەو هیچ هۆو مەبەستێکی تر بە خەیاڵیاندا نەهاتووەو نەبووە بە کۆسپ و ڕێگر لە بەردەم بانگەوازەکەیاندا ، چ جای ئەوەی لە هەمان کات و شوێندا دوو یان زیاتری شێوە بانگەوازی بەدی دەکرا ، بەڵام ئەمە نەدە بووە تێك دانی ئینی یەکری و لێك جیابوونەوە ، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەبونە تەواوکەری یەکری و هەمان مەبەستیان بەدەست دەهێنا کە ڕەزامەندی خوای گەورە بوو ... ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە

به هیچ شێوەیەك لێك تێهەڵگەیشتن و دووبەرەکایەتی نەبووە ، بەڵام ئەوەندەیە سنووردارو بە پێی بارو دۆخی ئەو کاتە لایەکیان خۆی لە مەیدان کێشاوەتەوەو ڕێگای بۆ لاکەی تر چۆڵ کردووە .

لەو کاتەی عومەری کوڕی خەتاب ( خوا لێی ڕازی بێت ) شمشێر لە کالان دەردێنێ و هەڕەشە لە کافران دەکات و پێیان دەڵێ ، کێ دەیەوێ دایکی جگەر سوتاو بێ و منالەکانی هەتیوو بکەون و ژنەکەی بێوەژن بکەوێ با لەو پشت دۆڵە بمکاتێ .(۱) ، دەبینین ئەبوبەکری سەدیق ( خوای لێی ڕازی بێت ) لە پەنا ئیین و دەغنەی بێ دین خەریکی قورئان خوێندنەوەیەو فرمێسك بە چاوەکانیدا دێتە خوارێ و منالو کۆیلەو کەنیزەی گەرەکی لە خۆی کۆکردۆتەوەو سەرسامی کردوون . هەر ئەم بوو کاتی خەلافەتی بەگوێی عومەری نەکرد لە وازهێنان لەو عەرەبانەی کە تازە موسلمان بووبوون و ئیسلامەتی بە تەواوەتی لە دڵیاندا نەچەسپی بوو قەدەغەی زەکات دانیان کردو فەرمووی ( بەو خوایە دەبێ بجەنگم لەگەڵیاندا ئەگەر قەدەغەی دانی بکەن کە کاتی خۆی دەیاندا بە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم )(۲).

یان ئەوەتا لە ( بیعة الرضوان ) کاتێ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئەمر بە ئیمامی عومەر دەکا کە بچێت بۆ مەککەو بە قوڕەیشیەکان ڕابگەیەنێ بۆ شەڕکردن نەهاتوون و مەبەستیان حەج کردنە لە وەڵامدا دەڵێ : ئەی پێغەمبەری خوا بۆ ئەم کارە عوسمانی کوڕی عەفان بنێرە ، چونکە کەس و کارەکەی لە مەککە دەتوانن بیپارێزن ...

لەو کاتەی سەعیدی کوڕی جوبەیرو عەبدوالرحمانی کوڕی

---

(۱) عبقرية عمر / عباس محمود العقاد ص۹۳ .
(۲) الخلفاء الراشدون / عبدالوهاب النجار ص٤٩ .

ئەمەشو شـوێن کەوتوانیـان دژی حەجاج دەستیان دایـە شۆڕش ، حەسەنی بەسری خەریـکی فیقهو ئیرشادو قوڵ بونەوەیە لـە ئاینو لـە مێژوودا بە ( مجدّد ) ناسرا •

هیچ کاتێك لەمانە کلاو ێکی وایان نەکرد ئیش لـەوی تر تێك بدەنو هەوڵدانی ئەوی تر مایە بووچ بـکەنو بکەونە ڕەخنەو توانج لە یەك گرتن • بە درێژایی مێژووی ئیـسلام لەم نموونانە دووبارەو سێبارە بوونەتەوە •

جـا ئەوەی ئیمڕۆ لای ئێمە دەبینین پێچەوانەی ئەمەیە زەقیو بەدیار خستنی تەنها شێوازێکەو فەرامۆش کردنی شێوازەکانی‌تر ، وەك ئەوەی هیچ ڕۆڵێکیان نەبێت لـە زیندوکردنەوەی موسڵمانانو دەرس وەرنەگرتن لـە تاقی کردنەوەی ئەو زانایانەی کـە توانیان سەرتاپا کرو کلۆڵی موسڵمانانی ئەو کاتە بگۆڕن بە سەرفرازیو خەڵـکی بـکەیەنە ژێر باڵی ئاسایشی ئیسلام •

ئەم هەوڵدانەی کاك ئازاد قەزاز بە داناني ئەم زنجیرەیە بریتی‌یە لە دیاری کردنی جمکێکی ئەو ڕۆژگارانەی کە ئەو پیاوە مـەزنانە دەوری خۆیان تیا بینیوەو بە ئاشکرا لە مەولانای ڕۆمیو شێخی گەیلانی هەستمان پێ‌کردو ئەمەش کەڵە زانایەکی‌تر کە ئیمامی سەرهەندیەو بـە ڕاستی خـوای گـەورە دەقـاو دەق بانگکەری گونجاو بە شێـواز گونجاوەوەی تەرخان کرد بۆ گۆڕینی ئەو بارە نالەبارەی ئـەو کـاتەو بەجێ هێنانی ئەمری خۆی بوو کە دەفەرموێ ••• ( انّا نحنُ نزّلنا الذّکر وانّا لهُ لحافظون ) •

دلشاد قەرەداغی

# پێشەکی

ئەگەر چاوێك بخشێنین بەو نوسراوانەی تا ئێستا بە زمانی کوردی دەربارەی ئاینی ئیسلامی پیرۆز نوسراون ، زۆر بە دەگمەن یان هەر بابڵێین نیە خۆی دابێت لەو ماوەیەی نێوان چەرخی صەحابەو سەردەمی ئێمە ، یان باس هەر باسی سەردەمی پێغەمبەرە صلی الله علیه وسلم یان باس باسی چەرمەسەری‌و گیروگرفتی ئەم سەردەمەی خۆمانە ئەویش بەبێ‌ە چلی‌و هەڵبروزکاوی‌و کاڵو کرچی‌یەو سود وەرنەگیراوە لەو ماوە مێژوویی‌یەی پاش سەردەمی زێڕینی صەحابەکان، سەرەڕای ئەوەی کە مێژوو کانگایەکی بەسودە بۆ کەڵك وەرگرتن‌و سود وەرگرتن لە تاقی‌کردنەوەو ئەزمونی ڕۆژانەو سەردەمی ڕابردووی موسڵمانان بەتایبەتی‌و هەموو جیهان بەگشتی هەروەکو (کیرد)[1] دەڵێ « مێژوو گرنگە بۆ ئەوەی بۆچونێکی ڕاستەقینەمان پێ ببەخشێت بەرامبەر بەو شتانەی لاوەکی‌و کاتین‌و ئەوانەی هەمیشەیی‌و نەمرن لە ژیانی ئادەمیزددا »[2] .. کەواتە مێژوو وەکو پێوانەیەك وایە کە بتوانین زۆر

(۱) کیرد ( ۱۸۳۵ ـ ۱۹۰۸ ) فەیلەسوفێکی لاهوتی بەریتانی‌یەو کاتی خۆی نوستادی فەلسەفەی ڕەوشتی‌بوو لە زانکۆی گلاسکۆ نوسینی زۆرە لەسەر فەلسەفەی ( کانت )

(۲) علم التاریخ / ج.غرنشو / الترجمة والتعلیق / عبدالمجید العبادي

شت بێوینو بمان گەیەنێتە ئەنجام بەهۆی ئەو ڕووداوو بەسەرهاتانەی لە پێشوودا ڕووی داوە .. هەروەك جەوە ئەللن دەڵێ : « دیراسەکردنی مێژوو چالاکی بە فیکر دەبەخشێتو دەیکاتەوەو لە زۆر ڕێگای جیاجیاوە یارمەتی دەدات »(۱) .

بۆیە گرنگە هەموو خاوەن فیکرەو ڕێڕەوێك ئاگاداری ژیانی ڕابوردوی فیکرەو ڕێڕەوی بزووتنەوەکەی بێت هەر لە سەرەتاوە تا ئەگاتە لای ئەوکەسە خۆی ، نەك تەنها لە سەرەتاوە شتێکی لێ بزانێتو تێر ئەو ملوەیەی نێوان خۆیو ئەو سەرەتایەی لە بیر بچێتەوە وەکو نەبوو وابێ ! ، دەبێ بزانێ بە چ شێوەو ڕێگایەك گەیشتۆتە لای ئەو ، چونکە لە نزیکترین سەردەم لە خۆیەوە زیاتر تێ دەگات وەك لە دورترین سەردەم لە خۆیەوە ، هەروەکو (سیلی) لە یەکێك لە لێدوانەکانیدا دەڵێ « مێژوو قوتابخانەی ڕامیارییە ، بەبێ برێکی کەم لە مێژوو- بەلایەنی کەمەوە -ئادەمیزاد ناتوانێ گرنگیو سەربەرشتییەکی ماقوڵانەی کاروباری ڕامیاری بکات ، بەبێ زانینێکی زۆر لە بارەیەوە ناتوانێ هیچ جۆرە حوکمێکی ماقوڵانە دەربکات لە هیچ کاروبارێکیا ، مێژوو دیراسەیەکی گرنگە بۆ هەموو مەدەنیەك ، بەڵکو دیراسەیەکی گرنگی ناکە ، کە شایستەی پیاوانی حوکمو یاسا دانەران بێت »(۲) .

بەڵێ ، بۆ ئەوەی موسڵمانان زیاتر لە ئیسلامو ژیانی صەحـابەو

---

(۱) علم التاريخ ج٠هرنشو الترجمة والتعليق ـ عبدالمجيد العبادي

(۲) هەمان سەرچاوەی پێشوو

سەردەمی پێغەمبەرێتی تێ بگەن پێویستە دیراسەی مێژوو[1] بکەن‌و هەنگاو بە هەنگاو لە لای خۆیانەوە سەربکەون تادەگەنە سەرچاوە خاوێن‌و بوختەکەی ئیسلام ، ئەمەش لە ڕێگای پلیکانەی مێژوومەوە دەبێت[2] .. چونکە لە ڕاستیدا ئەو سەردەمە کەمەی سەحابەو پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ی تێدا زیاوە ئیسلامەکەیە بە جڕی‌و پڕی‌و خەستی ، پێویستیان بە ڕوون‌و شیتەڵ کردنەوە هەیە چونکە هەر چی ڕوودەدات‌و پەیدا دەبێت لە پاش ئەوان هەموو لە ئیسلامدا بە لایەنی هێزو ئامادەیی یەوە ( بالقوة ) هەبووە ئیتر وردە وردە لە ڕووی کردەوەو واقیعەوە ( بالفعل ) دێتە کایەوە بە مەرجێ لە ڕووی شەریعەتەوە هیچ دژواریەکی نەبێت ، دەنا ئەوە دوورە لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامـــەوە ،

---

(1) کە دەڵێین مێژوو بگێڕینەوە ، هەر تەنها بۆ دەمەتەقێ‌و شانازی کردن نەبێت بە ڕابوردوومەوە ، ئیتر خۆمان پاڵی لێ بدەینەوەو هیچمان لە دەست نەیەت ، چونکە شانازی‌و فەزڵو چاکە بۆ پیاوانی سەردەم خۆیەتی نەك بۆ ئێمە ، کاتێك شانازی‌و فەزڵو چاکە بۆ ئێمەیە خۆمان شتێکمان لە دەست بێت‌و بەڵەرکی سەرشانمان هەڵسین وەکو پێویست چونکە مێژوو وەکو دکتۆر محمد سەعید رمضان البوطی دەڵێت « مێژوو مولکی ئەو ڕۆژەیە کە تیایدا لە دایك بووە » .

(2) ئیبن‌و خەلدون ( مێژوونوس‌و دامەزرێنەری کۆمەڵ ناسی ) ، دەڵێ : هونەری مێژوو لەو هونەرانەیە کە ڕێبازەکەی بە نرخە ، پڕ لە کەڵکە ، ئامانج بەرزە دەمانناسێنێ ، بە ئەحوالی گەلانی ڕابوردوو ڕەووشتیان ، بە پێغەمبەران و ژیانیان بە پاشایان‌و دەوڵەت‌و سیاسەتیان ، تا وەکو سودیان لێ وەربگرین لە شوێن کەوتنیان ، بە دوور بین لە هەڵەو بێ هەڵخلیسکان ..

مقدمة ابن خلدون ص٧

چونکه ئیسلام زیندووەو بە زیندوییش دەتوانین لێی تێ بگەین .
پێم نالێی ئەگەر ئێمە نێوان پێغەمبەر صلی اللّٰە علیە وسلمو صەحابەکانمان بچڕاندو جیامان کردنەوە لەو مێژوووەی تا ئەیشتۆتە لای ئێمەو ئەو ماوەیەمان مراند ئیتر چۆن لەوان تێ بگەین !!.

کەواتە بۆ تێ گەیشتن لە صەحابەو سەردەمی پێغەمبەر صلی اللّٰە علیە وسلم ئەوا پێویستە دیراسەی ئەو پیاوچاکانە بکەین کە نوری ئەوانو لەزەتی جوزئی ئەوانیان تێدایە . . یانی صەحابەکان وەکو شریتێکی پێچراوە وانو ئەو پیاو چاکو ئەولیاو نوێخوازانە دەیان کەنەوە، بۆ ئەوەی زیاتر تێی بگەین .. چونکە ئەو ماوەیەی صەحابەکان بەخێرایی بڕیویانە بەهۆی نورو بەرقی پێغەمبەرێتی بووەو بە زووترین کات گەیشتون ، بەلام ئەولیاو نوێخوازەکان ئەو ماوەیە بە لەسەرخۆیی یەوە دەبڕنو ئێمەش چاکتر لێی تێدەگەین ، ئەو دوا پلەیەی وەلی یەك دەیگاتێ سەرەتای نزمترین پلەی صەحابی یە ، نەك وەکو هەندێ کەس تێ گەیشتون ، وەلی لە صەحابە پیرۆزترو پایەبەرزترە ، گوایە لە وەلی یەکاندا کەرامات زۆرە .. جارێ دەبێ ئەوە بزانین کەرامات پێوانەیەك نی یە بۆ پایە بەرزی یان نزمی کەسێك ، دووەم وەکو وتمان ئەو صەحابەیە ماوەکەی کە گەیشتوە بە خوا ئەمەندە بە خێرایی بڕیویەتی چاوی بە زۆر شت نەکەوتووە تاوەکو کەرامەتێکی لێ دەرکەوێت ، وەکو ئەو کەسەی کە بەپێ ماوەی نێوان دوو شار ببڕێت زۆر شتی چاو پێ دەکەوێت بەلام ئەو کەسەی کە لە ڕۆکێتێکدایە نابینێت ، بێ گومان سواربوونی ڕۆکێت بایەخدارترە لە پیادە .

بەلێ ؟ وەلی بە پیادە ماوەکە دەبڕنو صەحابەکان ئەو ماوەیە بە

سواری ڕۆکێت بڕیویانە(١) ٠

جا ئەو نوێخوازو یاوچاکانە دەتوان ئەو شێوازو ڕێبازە بدۆزنەوە کە لەو سەردەمەدا ئاینی سەر لە نوێ بێ زیندوو دەکرێتەوەو گیانێکی نوێی سەر لەنوێ دەکاتەوە بەبەرداو دەیکاتە کائینێکی زیندوو دەژێتەوە ، هەروەکو عەقیدەیەك(١) کاری خۆی دەبینێتەوە چونکە شت

---

(١) ( بدیع الزمان ) دەڵێ : هاوڕێیەتی پێغەمبەر ئەکسیرێکی زۆر مەزنە ، کاریگەرییەکی هێندە لە ڕادە بەدەری هەیە ، ئەوانەی کە بۆ ماوەی یەك دەقیقە پێی بەهرەمەند دەبن وایان لێ دەکات ئەمەندە نوری حەقیقەت بەدەست بهێنن ، کە یەکێکیتر چەندین ساڵ لە تەمەنی لە سەیرو سلووکدا سەرف بکات ، ناتوانێ پێی بگات ٠٠ چونکە : لە هاوڕێیەتی ئەو پێغەمبەرەدا ـ صلى الله عليه وسلم ـ ڕەنگ گرتنێکە بەڕەنگی حەقیقەتو پێچەوانە بوونەوەی نورەکانێتی ، خەڵکی دەتوانێ بە تیشکدانەوەی لەو نورە مەزنانە بەرەو مەرتەبەی پیرۆزو پلەی بەرز سەرکەوێت بەرزترین مەقامی ـ بەهۆی شوێنکەوتوویی‌و نزیکییەوە ـ دەست کەوێت ، نمونەی لەمەش وەکو خادمی سولتانێکە کە دەتوانێ بگاتە جێگای وا لە کۆشکدا گەورەترین پێشەواو میرەکانی سولتان ناتوانن بیگەنێ ٠٠ هەر بەهۆی ئەم لەهێنییەوەیە مەزنترین وەلی ناتوانێ بگاتە مەرتەبەی صەحابەیەکی پیرۆزی پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ باشکۆی بەیامی ئیجتهاد ٠

(١) ئیعتقاد بریتییە لە حاڵەتێکی دەروونی‌و ، پاش بڕیاردان دێت ، لە ئەنجامی دووپات بوونەوەی بە بەردەوامی دەبێت بەخوو ، بە کارو ژیانەوە خۆراك دەدرێ ، جا ئەو باوەڕەی کە کردەوەی لەگەڵدا نەبێت لەوانەیە ڕاستو تەواو بێت ، بەڵام لەوەندە ناخایەنێت توشی خاو بوونەوەو لەناو چون دێت ٠

سایکولوجیة القصة في القرآن

د٠ التهامي نقرة ص١١٥

زانین‌و مه‌علومات به ته‌نها نابێته پاڵ پێوه‌نه‌ر ، به‌ڵکو بوون به عه‌قیده‌و بیروباوه‌ڕ ده‌بێته پاڵ پێوه‌نه‌ر ، یانی ( ان یعلموا ) هیچ کارناکات ئه‌گه‌ر نه‌بێته ( ان یعتقدوا )[1] .

که‌واته گه‌یاندنی ئیسلام هه‌ر قسه‌و وته‌و زانیاری گوێزانه‌وه نیه به‌ڵکو ده‌بێ ببێته فیکره‌یه‌ك‌و له ناخدا ڕه‌گ داکوتێت ، چونکه ( فیکر ناوخۆیی‌یه‌و بێ‌ده‌نگی‌یه به‌ڵام وشه بلاوه‌و بۆ هه‌موانه ، حه‌قیقه‌ت ته‌لقین نادرێت‌و بواره‌که‌ی زمان (اللغة)نیه ، به‌ڵکو حه‌قیقه‌ت وه‌رده‌گیرێت‌و به‌ده‌ست ده‌هێنرێت ، جا له کاتی ده‌ربڕیندا په‌نا ده‌برێته به‌ر شتی ده‌ره‌کی ئه‌ویش ناوزنه .. که‌واته حه‌قیقه‌ت له ده‌وی ده‌ره‌وه باس ده‌کرێت‌و له ناوماندا دژی ، له هه‌مان کاتدا ده‌بێ له ناخماندا گه‌شه بکات‌و پێ بگات )[2] . ئه‌مه‌یه هاوکێشه‌که یه‌کسان ده‌کات .

ئه‌م ده‌وره‌ی که ئه‌م پیاوانه ده‌بینن هۆیه‌که‌ی له‌وه‌دایه توانای هه‌زم کردن‌و شیتەڵ کردن‌و هۆنینه‌وه‌یان هه‌یه‌و ئه‌وه‌ی وه‌ری ده‌گرن ده‌زانن چۆنی به‌خشن ، ئه‌وه‌ی فێری ده‌بن ده‌زانن چۆن بیگه‌یه‌نن ، ئه‌وان زۆر چاك له سه‌رده‌می خۆیان‌و پێش خۆیان‌و سه‌رده‌می صه‌حابه‌و پێغه‌مبه‌ر صلى الله عليه وسلم تێگه‌یشتون ، که چاك تێگه‌یشتن‌و ڕاست بۆی ڕۆیشتن هه‌ڵبه‌ته به چاکی‌و ڕاستی ده‌یگه‌یێنن ، هه‌روه‌کو هه‌نگ له شیله‌ی گوڵی جۆراو جۆر ده‌مژن‌و پاش چه‌ند کار له یه‌ك کردنێك له ناخیانه‌وه هه‌نگوینی پاك‌و بوخته ده‌به‌خشن ، ئه‌گه‌ر هه‌ر شیله‌که‌یان

---

(١) المستقبل لهذا الدين ـ سيد قطب .

(٢) الفلسفات الهندية ـ د. علي زيعور

بداینەتێ بۆگومان بۆمان نەدەخورا ، کەچی بەو کارەیان وایان کردووە نەك هــەر تامی خۆش دەکەنو بەس بەڵــکو دەبێتە دەرمانێك بۆ سەدان نەخۆشی دەست دەدات ٠٠لە ڕاستیدا ئەمەیە زانایی ، ئەمەیە نوێخوازیو بلیمەتیو لێهاتووییو ڕاماری ، چونــکە زانیـــاری کۆکردنەوەو گوێزانەوەی بە وشكو برنــگیو هەروەکو خۆی ئەمە هیچ مەرجێـکی زانایی نیــە ، بەڵــکو زانا ئەو کەسەیە هەر چەند زانیاری‌یەکی کەمیشی پێ بێت بتوانێ ئەو زانیاریانەی کۆی کردۆتەوە وەکـــو ملوانەیەك بیهونێتەوەو بیکاتە شتێکی مانادارو مەبەستدار ، دەنا هەر کۆمــــەڵە مووروێەکی پێ بێتو بەم لاو ئەو لادا بڵاوی بــکاتەوە ئەمـــە هیچی نەکردووە ، چونــکە مووروو هــەر مووروەو هیچ مانایەك نابەخشێت ئەگــەر نەکرێت بە ملوانکەیەکی جوانو ڕەنگین ٠٠ هەروەکو ئیــمامی شافیعی دەفەرموێ ( جامع العلوم ) هەیەو ( عالم ) هەیە ، ( جـــامع العلوم ) بریتی‌یە لەو کەسەی تەنها مەعلومات کۆبــکاتەوەو بەس ، بەڵام ( عالم ) ئەو مەعلوماتانەی کە وەری دەگرێت لەگەڵ خۆیدا وا تێــکەڵ دەبێت تا دەبێتە سیفەتێك بۆیو ، دەیــکاتە زانا ٠٠٠

جــا وا ئەمجارەش لەگــەڵ زمارە سێی ئەم زنجیرەیە یـــەك دەگرینەوە کە باسێکی ئیمامی سەرهەندی‌یە ، تا بزانین ئەم پیاوە چۆن خزمەتی کردووەو ئیسلامەکەی گەیاندووە ٠٠٠ لە ڕاستیدا زنجیرەی یەکــەم ( مەولانا ڕۆمی ) ڕەنــگی خۆشەویستی لــە خۆی گرتبــوو چونــکە سەردەمی مەولانا خۆشەویستی‌و عاتیفە بە تەواوەتی وشـــکی کردبوو ، بۆیە ئەم لەم لایەنەوە بۆی چووە ٠٠ لە زنجیرەی دوومـــدا ( شێخی گەیلانی ) زیاتر ڕەنــگی ڕۆحـــی پێوە دیاربوو چونـــکە سەردەمەکەی وای پێویست دەکرد لە ڕۆحیانەتو عیادەت زیـــدوو

بکرێتەوە ، بەڵام ئەم ژمارەیە کە ئیمامی رەببانی‌یە(1) لایەنی فیکری پێوە دیارە چونکە سەردەمەکەی پێویستی بە زیندووکردنەوەی فیکرەی ئیسلامی بوو ، بۆیە ئەمیش لەم دەروازەیەوە بۆیان چوو بوو .. کەواتە هەر نوێخوازێك رێبازێکی تایبەتی هەبووە بۆ گەیاندنی یەك شت ئەویش ئیسلامەکەیەو ، بەیارمەتی خوای گەورە لە زنجیرەی چوارەمدا ( سەعیدی نورسی ) بدیع الزمان تان پێش کەش دەکەین تا بزانین ئەم چ لایەنێکی گرتۆتە بەر لەم سەردەمەی خۆماندا .

ئیتر هیوادارم سود بەخش بێت ، ئەمجا لەکەم و کوڕی بـبورن و خوداش ئاگای لە هەموو شتە .

ئازاد رەئوف قەزاز - رانیة ١٩٨٦

---

(1) ئیمامی‌رەببانی یا سەرهەندی یا ئەحمەدی فاروقی یا مجدد الالف الثانی هەموویان نازناوی ئەم پیاوە مەزنەن ، بەڵام ئێمە زیاتر ئیمامی رەببانی بە تایبەتی ئیمامی سەرهەندیمان بە کار ێناوە چونکە بەم دوو ناوە زیاتر ناسراوە .

# داهێنانو داهێنەر ( الابداع والمبدع )

هەستو سۆزو هەڵچونی کەسێك ، کە دەری دەبڕێت بەرامبـەر بەوهەڵوێستانەی لـــە دەوروبەریدان جۆراوجۆرنو ـ دەوروبەری سروشتیو کۆمەڵایەتی ـ بە دوو جۆر هەست دەری دەبڕێت :

هەستی ئیجابی : بەردەوام بوونی ئەم هەستە دەبێتە هۆی دڵخۆشی و چالاکی مێشکو ، زیاد بوونی وزەی زیندەگی جەستەییو ، متمانە بە خۆکردنو ، گەشبینی لە ژیانداو ، تێکۆشانێکی زۆر بۆ سەرکـــەوتن بەسەر چەرمەسەرییو گیروگرفتدا •

هەستی سیلبی : دەبێتـــە هۆی پێچەوانەی ئەوانەی کە لە هەستی ئیجابیدا باسمان کرد ، •• جا هەست بە هەردوو لایەنی ئیجابیو سیلبییەوە بزوێنەری ڕەفتارو هەوڵدانو تێکۆشانن ، یان هۆی سەرەکییە لە هەر دوو حاڵەتەکەدا بۆ پێشکەوتنو هەوڵدان یان بێهیواییو وەستان ، بـــە مانا گەشبینی یان ڕەش بینی[1] ••

(١) بە دەسکارییەوە سود لـــە ڕۆژنامەی ( طب وعلوم ) وەرگیراوە ژمارە ٦٢٢ سالی ١٩ سێ شەممە ٢٣ ئەیلول ١٩٨٦ •

بەڵێ هەمیشە ، داهێنەرانو نوێخوازانو نوێکارانو چاکەخوازان، گەشبینو خۆش هیوان .. هەر ئەوانن دەتوانن کۆمەڵ بگۆڕنو ، بەرەو چاکتری بەرن..ئەمەیش بە گەرمیو کەفو کوڵی دڵیانو ، بیرکردنەوەو لێکدانەوەو لێکۆڵینەوەی زەینو هۆشو عەقڵیانەوەیە ، چونکە بە تەنها کەفو کوڵی دڵ بەس نیە ئەگەر بێتو عەقڵ حەکیمانە یارمەتیدەر نەبێت .. هەروەها عەقڵیش بە تەنها ناتوانێ ئەم دەورە ببینێ ، بەڵام هۆکارێکەو هەردەبێ بێو پێویستە بۆ داهێنان .

( ئەوەی کە ڕوونو ئاشکرایە ئەوەیە ، ئەو هەموو دۆزینەوە مەزنانەی کراون ، هەموویان هەر بەتەنها لە ئەنجامی بوونی عەقڵەوە نەبووە ، چونکە عەبقەریو بلیمەتەکان لەگەڵ ئەو هێزەی لەڕووی تێبینی کردنو تێگەیشتیانەوە هەیانە ، سیفاتی تری وەکو ڕووناکی دڵو ئەندێشەی داهێنەرانەیان هەیە .. بەهۆی ڕووناکی دڵیانەوە هەست بە شتی وادەکەن کە خەڵکی تر لێی بێئاگان ، ئەو پەیوەندیانەی لە نێوان ئەو دیاردانەی بە ڕواڵەت لەیەکەوە دوورنو ، لە یەکتر جیاوازن هەست پێدەکەنو دەیان دۆزنەوە ، هەروەکو بلێی ، بێ ئەوەی بەخۆیان بزانن هەست بە بوونی گەنجینەیەکی شاراوە دەکەن ... ئەو پیاوانەن زۆر بە ئاسانی ئەو ئەرکانەی سەرشانیان دەزانن کە پێویستە لەو سەردەمەدا پێی هەڵسن )[1] ..

کەواتە ڕوون کردنەوەی حەقیقەتی نەزانراو بەبێ یارمەتیدانی عەقڵ مەسەلەیەکی ڕوون نیەو ، عەقڵیش بەبێ ئەندێشەو دڵ ڕووناکیو وردبینی ، دەورێکی ئەوتۆی نابێ کە جێی باسکردن بێت .

---

(١) الكسيس كاريل ـ الانسان ذلك المجهول ص١٤٥ـ١٤٦

لەمەی پێشوو بۆمان دەرکەوت کە کەف‌و کوڵ‌و گــەرمی دڵەو ئامەزرۆی گەیشتن بە ئامانجێـــکی نەزانراوو عەقڵ بەکارهێنان ، دوو هۆی سەرەکین بۆ داهێنان . ( یەکێك لەو هۆسەرەکیانەی کە (گلیفورد) دایناوە بۆ کەسێکی داهێنەر پێویست بێت ئەوەیە : توانستێکە ، هەست بە گیروگرفت دەکات ، دەبینی کەسێك تێنی هەڵە لە شتێکدا دەکات ، یان پێویستی بە چاکردن‌و دەستکاری کردن لە شتێکدا دەکات ، کەچی لەهەمان کاتدا خەڵکانی ئاسایی هەستی پێ ناکەن )(١) .

جـــا تێبینی کردنی کـەم‌و کوورِی پاڵ بە داهێنەرەوە دەنێت بۆ داهێنان . بۆ نموونە ئەدیسۆن هەمیشە هـــانی یارمەتیدەرانی دەداو دیوەت ، « دەبێ ڕێگایەکی چاکتر هەبێت ، بۆی بگەڕێن » . بەڵام ئەو کەسانەی کە داهێنەر نین بە نیوەچڵی ڕازی دەبن‌و لە نیوەی ڕێـــگا دەوەستن .

( هەروەها ، هەندێك جار داهێنان یا بیری نوێکاری بریتیە لەچاو پاخشاندنەوە بە شتێکدا کـە لەوە وپێش زانراوە ، بەڵام بە جۆرێك کە چەشنە گۆڕان‌و دەستکاری کردنێکی تێدا بێت . هەمیشە پـــاوانی داهێنــــەر خـــۆیان نەبەستۆتەوە بە مەرجی تایبەتیەوە لـــە بواری داهێنانەکەیاندا ، لەگەڵ ئەوەشدا سەربەست نین تا ڕادەی ئژاوە نانەوە بەڵکو سەربەخۆن بەڵام سەربەخۆیی‌یەکی ڕەسەنانە ، لەو کاروبارانەی کـە پەیوەندیان بە بواری داهێنانەکەیانەوە هەیە ، هەمیشە هەوڵی ئەوە دەدەن لـە یاســاو داب‌و نەریت لانەدەن‌و ، لە بواری داهێنانیان بەرهەم هێنەرن . ئازایەتی داهێنەر لەوەدایە کـە دەرك بـە جیهانی دەرەوەو

---

(١) الابداع وکیفیة تربیته ـ د. فاخر عاقل .

جیهانی نلخی خۆی دەکاتو ، دەشتوانێ گونجانێك لە نێوانیاندا دروست بکاتو ، بەو دەروونە فراوانەی بتوانێ لە نێوان ئەو زانیاریە ناوخۆییەی خۆیو دەوروبەرو ڕۆشنیری دەرەوەیدا پەیوەندیەك دروست بکاتو بابەتێکی نوێی وا بێنێتە کایەوە کە واقیعی بێتو دژایەتی لەگەڵ ڕەسەندا نەبێت تەنها لە دیمەندا نەبێت ، کە لەگەڵ مێشكو زیریو ئاستی فیکریو ڕۆشنبیری ئەو سەردەمەدا بگونجێو بەرەو پێشەوەیان بەرێتو ، بتوانێ ئەو کەلێنەی کەوتۆتە نێوان نوێخوازانو دەستگرتووان بە کۆنەوە نەهێڵێتو ، هەر دوولاش بە ئاسانی لەیەکتری تێ بگەن )[1] .

( بول توراتس ) دەڵێ داهێنان خۆی لە خۆیدا هەست کردنە بە گیروگرفتو کەمو کووڕی کونو کەلەبەر لە زانینو زانستی سەردەمو توخمی لەناوچوو ، نەبوونی ڕێكو پێکیو ، ئەمجا دیاری کردنی تەنگو چەڵەمەکەو ، ڕوون کردنەوەیو ، پاشان گەڕان بە شوێن چارەسەرو لێکدانەوەی ..

دیسان دەڵێت : هەرکاتێ ئێمە هەستمان بە کەمو کوڕیەك یا ناڕێکییەك کرد ، ئەوا جۆرە دڵ تەنگیو نەگونجانێك لە دەروونماندا سەر هەڵدەدات ، لەبەر ئەوەیە ئێمە هەست بەبێ ئارامییەك دەکەینو دەمانەوێ لەو دڵ تەنگییە ڕزگارمان بێت ، جا کە تەماشا دەکەین ئەو ڕێبازو شێوازە باوو ئاساییانەی ئەو سەردەمە بەس نیە بۆ ئەم چارەسەریە ئەو کاتە ئێمە هەوڵ دەدەین لەو چارەسەریە باوو ناڕاستانە دوورکەوینەوە ، ئەمەش لە ڕێگەی گەڕانو دەست نیشانکردنو ،

(١) هەمان سەرچاوەی پێشو

ڵو گۆڕ کردنو لێکدانەوەو ، هەڵسەنگاندن دەکرێت تا بتوانین ئـــەوە بدۆزینەوە کە بە شوێنیدا دەگەڕێین .

هەروەهـــا دەڵێ : چـارەسەری گیروگرفت بە داهێنان دادەنرێت ئەگەر بێتوو مەرجێك یان چەند مەرجێـــکی لـــەم مەرجانەی خوارەوە تیـــدابێت :

١ ـ کاتێ کە ئاکامی بیرکردنەوەکە نوێو بایەخدار بێت .

٢ ـ داواکاری ئەوەی نەبێت کـــە ئەو بیروڕا چاکانەی پێشوو ڕەت بـــکرێنەوە .

٣ ـ ئەو بیرکردنەوەیە داوای خرۆشاندنێکی بەتینو تێکۆشانێك بـکات کە ماوەیەکی زۆر بەردەوام بێتو ، زۆریش ڕۆجوو بێت .

٤ ـ لە ئەسڵدا گیروگرفتەکە خۆی لە خۆیدا ڕوونو ئاشـــکرا نەبێتو تەمو مژاوی بێت ئەم ڕوونی کاتەوەو ، داڕێژانی گیروگرفتەکەش بە بەشێك لە کارەکەی دابنرێت )[1] .

داهێنەر هەر ئەوە نیە کـــە بینی بە بەردەوامی بەرەو پێشەوە هەنـگاو بنێت ، بەڵـکو جاری واهەیە بەرەو دواوە دەگەڕێتەوەو بەخۆیدا دەچێتەوەو بەشـوێن چارێـکی تردا دەگەڕێت ، لەوانەیشە خەڵـکی وابزانن دەیەوێ کۆن زیندوکاتەوە . بەڵام نەختێر ئەو گەڕانەوەیە بۆ هەنـگاونانێکی نوێترو فراوانترە ، وەکو (کۆستلر) دەڵێت ، ئەم جۆرە شێوازە لە داهێنەراندا هـــەیە : « پاشەوپاش کشانەوە بۆ بازدانێـــکی

(١) الابداع وكيفية تربيته د. فاخر عاقل .

چاکترو بەرزتر • •

هەروەها (کوستلر) ساڵی ۱۹۵۹ وتی «کرداری لابردنی شتێك یان چەمکێك لە ڕەوتی ئاسایی خۆیی‌و ، ڕوانین بۆی لــە ڕەوتێــکی نوێتردا ئەوە بەشێکی سەرەکی‌یە لــە کرداری داهێنان ، ئەمــە کــاری تێکدان‌و کــاری دروست‌کردنە لە یەك کــاتدا • چونــکە پێویستی بە شکاندنی ڕەوتێکی عەقڵی‌و تواندنەوەی توخمەکانێتی لــە پێنــاوی بازدانێــکی چاکتر ، ئەمە لە یەك جوێ کردنەوەیەکە ، پێش پێکەوەنانێك کــــەوتووە »[1] •

( یەکێکی‌تر لەو هۆیانەی کــە یارمەتی داهێنان دەدات وەکـــو ( ماگلینون ) ساڵی ۱۹٦۲ سەرنجی‌داوە زۆری گوێزانەوەو چوون بــەم لاو لادا ، چونــکە بەکەڵکە بۆ شارەزایی پەیداکردن‌و خرۆشــــاندنی دەروونی وعەقڵی ، مانای وایە هەڵــکەندن لە شوێنەوارو ژینگەی ژیانی تایبــەتی‌و دوورکەوتنەوە لەو دەوروبەرەی لێی ڕاهاتووە یەکێکە لــەو هۆیانەی وا لە داهێنەر بــکات هەست بە شتی نوێ بــکات‌و پەنا بەرێتــە بەر تاکێتی‌و گۆشەگیری )[2] •

لە ئەنجامی ئەم باســەی پێشوو بۆمــان دەرکەوت ، داهێنەر ئــەو کەسـەیە کە بتوانێ بە داهێنەکەی گۆڕانکاری‌یەکی مەزن بهێنێتــە دی ، دارشتنی ئەو گۆڕانکاریەی بە جەشنێك بێت کە خۆی دەیزانێت ، جــا چ ماددی بێت یان مەعنەوی ، نەك تەنها گوێزانەوەی مەعلومــات بێت‌و بــــەس •

لێرەدا ئەم باسەی داهێنان‌و داهێنەرمان بۆیە هێنایە کایەوە ، تا لــە

---

(۱-۲) هەمان سەرچاوە

( مجدّد ـ نوێخواز ) چاك تێبگەین ، چونکە نوێخواز یەکێکە لەو کەسانەی کە داهێنەرن لە گۆڕینی ئەو کۆمەڵەی سەردەم ، ئەویش بە زیندوو کردنەوەو نوێ کردنەوەی ئاینەکەی ، بە شێوازێك کە لەو سەردەمەدا پێویستە ، دەنا خۆ دڵسۆزی تر زۆرن‌و خەمخواری ئیسلام هەر هەنو هەر بوون ، بەڵام کەمێکیان دەتوانن داهێنەر بن ، لە داهێنانی ئەو شێوازەی لەو سەردەمـــەدا پێویستە ، ئـــەوانەی دەتوانن ئـەو گۆڕانکاریانە بە شێوازێکی نوێ بکەن ، لە ئاینی ئیسلامدا بە (مجدّد) نـاســـراون •

کاری نوێخواز کە بریتی‌یە لە نوێکاری ( تجدید ـ Revival

بە مانای زیندووکردنەوەو بووژاندنەوەیە پاش کپ‌کردن‌و مت‌بوون لێرەدا باشترین پێناسەی نوێخواز کە بکرێت ئەو پێناسەیە یە کـــە مەولانا ( ابو الاعلى المودودي ) کردوویەتی‌و دەڵێ بەبێ گومـــــان نوێخواز پێغەمبەر نیە ، بەڵام لە سروشت‌و میزاجدا زۆر نزیکە لـــــە میزاجی پێغەمبەرێتی • ئەو خاسیەتانەی کە پێویستە لە نوێخوازدا هەبێت بریتیە لە زەینێکی ڕوون ، بیر تیژی ، فیکرێکی ڕاستی بێ خـوارو خێچ ، توانستێکی دەگمەنی وا کە بتوانێ ( ئیفراط‌و تفریط ) لە یەکتر جیا بکاتەوەو هاوسەنگی لە نێوانیاندا بکات ، هێندێکی بیرکردنەوەی وای هەبێت کـــە بتوانێ دوور لە کاریگەرێتی ئەو بارو زروفـــەی ئـــەو کاتەو بیروڕای کۆنی چەسپاو لەگەڵ درێژایی ڕۆژگار ، بیر بـکاتەوە ، هەروەها خاوەنی ئازایەتی‌و بە جەرگیە کی وابێت کە بتوانێ بەربەرەکانی زەمانەی تێکچوو بکات ، لە پێشەوایەتی‌و سەرۆکایەتیدا بەهرەدارانـە بێت‌و کاری ئیجتهادو بیناو پێك هێنانی بلیمەتانە بێت ، لەگەڵ ئەمانەشـدا هـەمووی دەبێ دڵئارام بێت بە فەرمایشتەکانی ئیسلام‌و موسڵمانێـــکی

ڕاستەقینەی وابێت کە بتوانێ لە نێوان ئیسلام و جاهیلیەتدا جیاوازی بکات تەنانەت بتوانێ لە کاروبارە هەندەکیەکانیشدا جوێکاری تێدا بکات و لە خۆڵەمێشی دەردو نەگبەتی کە بە درێژایی سەدەکان بە سەریەوە نیشتووە ، بیتەکێنێ ، ئەمەیە ئەو خاسیەتانەی کە کەس بەبێ ئەمانە ناتوانێ ببێت بە نوێخواز لە ئیسلامدا ، هەر هەمان سیفەتن لە پێغەمبەران و پێڕەواندا هەن ، بەڵام بە جەشنێکی گەورەکراوی(١) .

## نوێکاری ـ التجدید ـ(١)

١ ـ دیاری کردنی نەخۆشیەکانی ئەو دەوروبەرەی نوێخواز تێدا دەژی بە جەشنێکی ڕاست و ڕەوان ، ئەمەش بەوە دەبێت کە سەیری بار و دۆخی ئەو زەمانەی خۆی بکات و ڕوونی بکاتەوە کە جاهیلیەت لە کوێی کۆمەڵدا خۆی شاردۆتەوە و ، لە کوێوە خۆی کوتاوەتە ناویەوە و ، بزانێت شوێنەواری تاکو کوێ باڵی کێشاوە بەسەر ژیانیداو ، هەڵوێستی ئیسلامی ڕاستەقینە چیە بەرامبەر ئەم حاڵی حازرەی تێیدان .

٢ ـ تەدبیرکردن بۆ چارەسەرکردن ، یانی دیاری کردنی ئەو جێگایانەی خراپ بوونە و تێکچوون کە پێویستە چارەسەر بکرێن لە کاتی تێدا تاوەکو زاڵێتی جاهیلیەت نەمێنێ و ئیسلام بتوانێ لە ناو ژیانی کۆمەڵایەتیدا جێی بگرێتەوە ..

٣ ـ نوێخواز خۆی خۆی تاقی بکاتەوە و سنوری کارەکەی دیاری

(١) موجز تجدید الدین واحیائه ـ ابو اعلى المودودي .
(٢) هەمان سەرچاوە .

بکاتو هێزو توانستی خۆی بزانێت ، خۆی بەو لایەنەوە خەریك بکات کە دەتوانێ چارەسەری بکات .

٤ ـ تێکۆشان لە پێناوی کودیتایەکی فیکریو نەزەری بانی گۆڕینی فیکرەی خەڵکیو ، چەسپاندنی ئیسلام لە عەقیدەو هەستو ڕوانگەو ڕەوشتیاندا ، چاکردنی نیزامی پەروەردەو فێرکردنو زیندووکردنەوەی زانستو هونەرە ئیسلامیەکان . بە کورتی هێنانە کایەوەی عەقلیەتێکی ئیسلامی نوێو پوختە کراو .

٥ ـ هەوڵدان بۆ چاکردنێکی عەمەلی ، ئەوەش بە پوچەڵ کردنەوەی دابو نەریتی جاهلیەتو خاوێن کردنەوەی ڕەوشتو پڕکردنی دەروونەکان بە خۆشەویستی شەریعەت سەر لەنوێو ، هەڵبژاردنی ئەو پیاوانەی دەگونجێن بن بە پێشەوا .

٦ ـ ئیجتهاد کردن لە ئایندا ، مەبەست لەوەیە کە نوێخواز لە ( کلیات )ی ئاین تێدەگاتو ڕوانگەی بارو دۆخی شارستانیەتو پێش کەوتنو ئاوەدانی سەردەمی خۆی ڕوون دەکاتەوە ، وێنەی ڕێگایەك دەکێشێت بتوانێ گۆڕانکاریەكو چاکردنێك دروست بکات کە ڕەسەنی شارستانیەتی ڕابردوو ون نەبێتو سەلامەتی شەریعەتو ڕۆحی ئاین تیدا پارێزراو بێتو مەبەستەکەی تێدا بەدی بێت ، وا بکات کە بتوانێ ئیسلام بکات بە پێشەوایەکی جیهانی لە بەرپاکردنی شارستانیەتێکی ڕاستەقینە .

ئەگەر خۆت بەراوردێك بکەیت لە نێوان دەروونناسی نوێداو نوێخواز لە ئیسلامداو لێکیان بدەیتەوە تێ دەگەیت کە ئەو مەرجانەی پێویستن بۆ داهێنانو ئەو سیفاتانەی کە پێویستن لە نوێخوازدا هەبێت

دەبینی یەك دەگرنەوە ۰ بێ گومان داهێنان لە ڕوانگەی دەروتزانیەوە لە هەموو بوارێکی ژیاندا دەکۆڵێتەوە بە مادیو مەعنەوییەوە جا یەکێك لەو داهێنانەی لێی دەکۆڵێتەوە بریتیە لە دۆزینەوەی ئەو شێوازەی لایەنی فیکریو ئەقلیو عەقیدیو هەستو نەستی کۆمەڵێك بگۆڕێت ، جا ئەوەی ئێمە مەبەستمانە ئەو لایەنەیە ، نوێخواز دەیەوێت ئەو تێکچونو خراپەکاریەی بگۆڕێت کە لە ناخی ئەو کۆمەڵەدا ڕەگی داکوتاوە ۰ جا ئەو توانستەش کە داهێنەری کۆمەڵایەتی یان نوێخواز لە ئیلامدا هەیەتی دەگمەنەو لە کەم کەسدا دەست دەکەوێت وەکو (کونانت) ساڵی ١٩٦٤ وتی : « زانایەك لە پلەی یەکەم ، بە دە پیاویش لە پلەی دووەم لە بواری زانستیدا جێی ناگرنەوە ۰ لە ڕاستیدا گەلێکی نیە کە بە پیاوانی پلەی دووەم چارەسەری گیروگرفتێك لە پلەی یەکەمیان پێ بسپرێت ، تەنانەت ئەگەر بۆ ئەم کارەی زۆریشی لێ بکرێت ۰ چونکە پیاوانی کۆمەڵی دووەم زۆربەی جار لەم جۆرە هەڵوێستانەدا زیان بەخشن زیاتر لەوەی سوود بەخش بن »[1] ۰

ئەم پێشەکییەی خستمانە ڕوو لەسەر داهێنەرو نوێخواز بۆ ئەوەیە کە بتوانین لە ئیمامی ڕەبیانی تێبگەین تا چ ڕادەیەك نوێخوازو داهێنەری سەردەمی خۆی بووە ، ئەمەش بەوە دەبێ بزانین ئەوەی کردوویەتی لە سەردەمی خۆیدا چی بووە تا لە پێناویدا ناوی بنرێت نوێخواز ـ مجدد ـ ۰۰ بەڵام ئەوەشمان لە بیر نەچێت بۆ هەڵسانکاندنی بایەخی کۆمەڵایەتیو ئایدۆلۆژیەتی هەرکەسێك لە لایەن هونەرێتیو جوانی شێوازو لێهاتوویی و زیرەکیو چالاکیی بە پلەی

---

(١) الابداع وكيفية تربيته ـ د. فاخر عاقل ۰

یەکەم لە سەر ئەوە وەستاوە کە بڕوایە شوێنەوارو کەلەپوری ئەو کەسە بە چەشنێکی بەرەسەندنی مێژووانەی وردو قوڵو فراوان ، لەبەر تیشکی ئەو کەسانەی کە لە ئاستیدا بوونو لە سەردەمی ئەودا ژیاون ، لێرەدا توێژەر پێویستە چەند سەرنجێك بخاتە بەر چاوی یەکەم : پێویستە سروشتی ئەو کاتەی لەبەر چاو بێت کە ئەو کەسەی تیایدا ژیاوە لە ڕووی خاسیەتی مێژوویی لە هەر دوو لای ناوچەیی‌و جیهانی‌یەوەو لە لایەنی دژواری کۆمەڵایەتی کە لەو سەردەمەدا باو بووەو تا ئەوە بپشکنێ ئەو کەسە تا چ ڕادەیەك چۆتە ناو ئەو زروفەوەو تا چ ڕادەیەك لە ژیانیدا کاریگەر بووە !ە دووەم : پێویستە بەردە لە سەر نەزعەی گشتی‌و خاسیەتی کۆمەڵایەتی هەڵماڵرێت‌و بزانرێ تا چ ڕادەیەك لایەنی فیکری پێ گەیشتووەو هەست‌و نەستی تا چ ڕادەیەك گەرمی‌و گەفو کوڵی تێدایە ، تا بزانین شارەزایی‌و لێ هاتوویی‌و ڕەسەنی تێکۆشانەکەی‌و فراوانی ئەو بڕیارانەی بەرامبەر ڕووداوو خەڵکی دەری کردوون تا چ ڕادەیەك وردەکاری تێدا کردووەو لە هەڵێنجانی کۆمەڵایەتیدا تا چ ڕادەیەك قوڵ بۆی چووە ، هەروەکو چۆن لە بەرهەم‌و نوسین‌و تێکۆشانەکانیدا دەردەکەون ٠

جا بۆ ئەوەی بزانین ئیمامی ڕەببانی گلارەکەی تا چ ڕادەیەك مەزن بووە !ە دەبێ بزانین سەردەمەکەی چۆن بووە هەر چەندە بە درێژی لە بەشەکانی داهاتوودا باسکراوە بەڵام کورتەیەکی دەگێڕینەوە:

ئەو خراپەو تێکچونە عەقلی‌و فیکری‌یەو ، ئەو پشکەزبوونەوەیەی لە ئایین ، کە لەو سەردەمەدا سەری هەڵدابوو بەهێزترین دەوڵەت لەو کاتەدا لە دوای دەوڵەتی عوسمانی ـ پارمەتی دەداو پشتی دەگرت‌و ، زۆر لە زیرەکانو پێگەیشتووانی ئەو سەردەمە بە جەکی زانستی‌و

عەقـــڵی ، یارمەتیـــان دەدا ، ئەگەر ڕۆژگـــار هـــەروا بەردەوام بوایەو ، کـــەسێك بەرەنـــگاری نەکردایە ، یـــان ڕوداوێك وەزعی نەگۆڕیایەو ، وڵاتی چاك نەکردایە ، ئەو کاتە داهاتووی ئەم دەوڵەتەو وڵاتی ئیسلامی مەزن لە سەدەی یانزەیەمی کۆچیدا ، هـــەر وەکو داهاتووی ئەندەلوسی ئیسلامی دەبوو ، کە جیهانی ئەم سەردەمە بە ناوی ئیسپانیا نەبێت نایناسن ، یان وەکو داهاتووی (تورکستان)ی لێ بەســەر دەهات لەسەدەی چواردەیەمی کۆچیدا پاش شۆڕشی شیوعیەت کە کرا، بەڵام خوای گەورە ئەو وڵاتەی پاراستو پیاوێکی وای بۆ نارد کـــە بیپارێزێ لە کوفرو گومڕاییو تاریکی[1] .

مێژووی نوسی ئیسلامی ( العلامـــة السيد سليمان الندوي ) باسی بەسەرهاتی ئیسلامو غەریبیتی دەکات لە وڵاتی هیندا ، دەڵێ خەریك بوو بەسەر ئیسلامی بێکەس لەم وڵاتەدا هەزار ساڵ تێدەپەڕی لـــە سەردەمی ( مەلیك ئەکبەر )دا ، ساحرێکی عەجەمی هاتوو بە گوێیـــدا خوێندی ، کە ئەم ئاینەی تەمەنی گەیشتە هەزار ساڵ بلوی نەما ، ئیستاش زۆر پێویـــستە ئاینێـــکی خوایی نوێ پێك بێتەوە لە ســـەر دەستی پاشایەکی نەخوێندەوارو ، ئەو ئاینەش بسڕێتەوە کـــە نەخوێندەوارێك هێنـــابووی ، ئاگـــر پەرستان دەستیان بـــە ئاگر کردنەوە کرد لـــە پەرستگاکانیان ، دیانەکان لـــە ناو کەنیسەکانیاندا لە زەنگیان دەدا ، بورهمیەکان بتەکانیان دەڕازاندەوە ، سۆفیەکانو یۆگیەکان یەکیان گرتو مۆمیان لە پەرستگای هیندۆکیو کەعبەدا دادەگیرساند، ئەگـەر هـەر کەسێك دەیەوێت زیاتر لەوە تێ بگات کە ئەم بزوتەوە پێنج خشتەکی یە

(١) رجال الفكر والدعوة ـ ابو الحسن الندوي .

ج شوێنەوارێکی بەجێ هێشتووە با بڕوانێتە ( بستان مذاهب ) تا بزانێت چەندە لە خاوەن ( زنار )ەکان تەزبیحیان هەڵدەسوڕاندو ، چەندین لە خاوەن تەزبیحەکان لە ملیاندا (زنار)یان هەڵدەگرت ، ئەمجا بزانێت کە چەندین لە میرەکان ڕووی خۆیان لە بارەگای سوڵتاندا دەگوزاندو چەندین مەندیل بەسەر لە کۆشکی پاشایەتی ڕادەوەستانو ، لە مینبەری مزگەوتەکاندا دەیان وت : ( تعالى شأنه ـ الله اكبر )[1] .

لەگەڵ ئەمانەشدا هەموو ، دەنگێك لە لای سەرهەندەوە دەهاتو دەیووت :

« ڕێگە چۆڵ کەن ، خاوەن تەریقەت هات « مجددی فاروقی » بە شانو شەوکەتی فاروقیانەیەوە دەرکەوت ، ئەمەش ئەحمەدی سەرهەندی بوو » .

لە بەرامبەر ئەم بارە نالەبارە ، لە بەردەم ئیمامی سەرهەندیو هەموو ئەو پیاوە بەغیرەتانەی ئیسلام سێ ڕێگا هەبوو بۆ چارەسەرکردنی : ڕێگای یەکەم : لە وڵات گۆشەگیر بن ، جڵەوی بۆ بەرەڵا بکەن ، پەنا بەرنە بەر گۆشەو تەکیەکانو ، خۆیان بە زیکری خواوە خەریك بکەن .

ڕێگای دووەم : بە تەواوەتی هیوا بڕوا بێن لە چاکردنی سوڵتانەوە . کە بە نلو سەر بە حیزبێکی ئیسلامیە . وە بە دوژمنێکی کەللە ڕەقی ئیسلامی بزانن .

لە چوار دەوریان پیاوانیوا کۆبکەنەوە کە دڵیان بۆ ئاین بکوڵێو

(١) رجال الفكر والدعوة ـ الأمام السرهندى ـ ابو الحسن الندوي .

بەسەر هەستو سۆزیاندا گیانی جیهادو مردن لە پێناوی خوادا زاڵ بوو بێت ، کە خەریکن لە داخی بارو دۆخی ئەو سەردەمە شەق دەبەنو ، ئەمجا شۆڕشێك لە وڵاتدا بەرپا بکەن لە ڕێگەی عەسکەریو ڕامیاریانە ، تا هەوڵدەن کە کاروباری وڵاتو سوڵتە بدەنەوە دەست پیاو چاکێکی دیندار تا ڕووی وڵات بگۆڕیو ئەبێ بارو دۆخی زروفیش چاك بێت .

ڕێگای سێیەم پەیوەندی بە میرو ئەندامانی وڵاتەوە بەستن ئەو کەسانەی کە دەیان ناسنو لەوەو پێش پەیوەندیان لەگەڵیاندا هەبوومو بە دڵسۆزیان دەزانن تا چ ڕادەیەکەو بەرزی کەسێتییان دەناسنو ئاگایان لە دڵ تینانیانە بۆ ئیسلام ، گیانی ئیسلامەتیو هەستو سۆزی ئیمیان تیا بخرۆشێننو خۆڵەپێش لە سەر ئەو پشکۆ داپۆشراوانەی ناو دڵیان لادەنو ، گڕی تێ بەردەنو فوی پێدا بکەنو هانیان بدەن بۆ ئامۆژگاری کردنی سوڵتان ، ئەو دەمارە ئیسلامیەیان تێدا بخرۆشێنن کە لە باو باپیری باوەڕدارەوە بۆیان ماوەتەوە ، ئەمجا هەڵیان نێن بۆ پارێزگاری کردنی ئیسلامو تیمارکردنی ئەو دڵە بریندارانەی موسڵمانان تا خۆیان بە ڕەوشتی جوان بڕازێنەوەو دەروون بەرز بن لە ئاستی پلەو پایەدا )[1] .

بەڵێ ئەم سێ ڕێگایە کە لە بەردەمی تێکۆشەرانو خواپەرستانو پیاوچاکانی ئەو سەردەمەدا هەبوون تا بە بۆچوونی خۆیان کامیان بە چاکتر بزانن بۆ چارەسەرکردنی ئەو بارە نالەبارەی ئەو کاتە ـ زۆریان ڕێگەی تێکۆشانی چەکدارانەیان هەڵبژاردو بەچەندین ساڵ جەنگان

---

(١) رجال الفكر والدعوة ـ الأمام السرهندى ـ ابو الحسن الندوي

لەگەڵ سوڵتاندا بەڵام لە ئاکامدا هەر خوێن ڕژاندنبوو بێ ئەوەی هیچ لە بارو دۆخ بگۆڕێ .. زۆری تریشیان پشێوی تایفەی بە بەرداری بوون هەر خەریکی خۆیانو مریدەکانیان بوون .. ئیمامی ڕەبانی لە نێو ئەم زروفەدا دەژیو ئاگای لە هەموو ئەم کەینو بەینە هەبوو لێی دەکۆڵیەوەو ورد دەبێتەوە ، تێگەیشتبوو کە نە خوێن ڕشتنو نە دەستبەرداری هیچ چارەسەر نیە .. بۆیە بەشوێن ڕێگایەکی چاکتر دەگەڕا کە لە پێشدا بتوانێ شۆڕشێکی فیکریو عەقیدی بکات تا بتوانێ بە ئاسانی ئەو کردەوانەی سەر بەو فیکرەیەن تیایاندا بیجوڵێنێ .. بەڵێ ئەمەیە سیفەتی داهێنەرو نوێخواز هەر وەکو لە سەرەتاوە باسمان کرد..

داهێنەر کە دەیەوێت چارەسەری گیروگرفتێك بکات مەرج نیە شوێن ئەو چارەسەرە بلوانە بکەوێت ، یان لاسایی کردنەوە بێت بەڵکو بە شوێن ڕێبازو شێوازێکدا دەگەڕێت نوێ بێت ، بە خەیاڵی خەڵکی تردا نایەت ، ئەوەی هەستی پێ دەکات خەڵکی تر هەستی پێ ناکەن .

( بۆ نموونە ڕێگە یەکەم لەگەڵ دڵو دەروونی بەرزی هیمەت عەزیمەتی ئیمامدا ناگونجێت[1] .. بەڵام ڕێگەی دووەم تەنها ئەو کەسانە دەیگرنە بەر کە خاوەنی بیرو باوەڕو عەقلیەتێکی سیاسیو کورت بینو فیکرێکی سنوردارن ، کە کارەکەی لە پێشەوە بە دوو دڵیو گومان خرایی دەست پێ دەکات کەوا لە میری دەکەن لە ئەنجامی پەلە پەلو هەڵوێستیاندا بەرەیەکی دژی ڕژێم پێك بێنن و فەزڵی بدەن بە سەر حیکمەتی بانگەوازو عاتیفەی چاکردنو ئامۆژگاری کردن - تا ڕوو بە ڕوویان بوەستێتەوەو لە سەرەتای ڕێگادا بەرەنگاریان بکات ..

---

(١) بە درێژی لە بەشەکانی داهاتوودا باسکراوە

ئەمەش دەبێتە هۆی ئاژاوە نانەوەو پەرتەوازەیی وڵاتو خوێن ڕشتنی موسڵمانان ، بۆیە ئیمام ئەم ڕێگایەی هەڵنەبژارد بەڵکو ڕێگای بیناکردنی گرتە بەر لە جیاتی ڕووخاندن ، ڕێگای ئیجابی هەڵبژارد لە بری سەلبی ، دڵ نەرم کردنی هەڵبژارد لە جیاتی ڕەق کردنی ، ئەم ڕێگایەی کە دوورە لە هەموو ترسناکیو زیان بەخشینێك )(١) .

کەواتە لێرەدا ئیمام جگە لە تاکە ڕێگایەك کە بە خەیاڵی کەسدا نەهاتبوو لەو سەردەمەدا هیچی تری هەڵنەبژارد ئەویش ڕێگایەکی ئاشتی خوازانەو ئامۆژگاری کردنو بەکار هێنانی حیکمەت بوو لە بانگەوازیدا ـ بە درێژی لە بەشەکانی داهاتودا باسکراوە ـ لێرەدا لێهاتوویی و شارەزایی داهێنەرێتیو نوێخوازیو نوێکاری ئیمام بە تەواوەتی دەردەکەوێت ، ئەمە ڕێگایەك بوو هەرچەند بەرهەمەکەی درێژی خایاندو زۆری دەویست بەڵام ڕێگایەك بوو توانی شۆڕشێکی بەبڕ کردنی فیکری بێ باوەڕی بت پەرستیو دنیا پەرستی بەرپا بکات .. لە ڕاستیدا ئەوەیە شۆڕش ، خۆ شۆڕش هەر بە چەك ناکرێت بەڵکو مانای شۆڕش زۆر فراوانترە لە شۆڕشی چەکدارانە .. شۆڕشی پیشەسازی یان کشتوکاڵی مەبەست لە گۆڕانی فیکری مرۆڤایەتیە کە وایان لێ دەکات زۆر کاری نوێو کەرەستەی تازەی بیری نوێ بێتە کایەوە .. هەروەها سەدەی ڕاپەڕینیش (عصر النهضة) هەر هەمان مەبەست دەبەخشێت کە بریتی بوو لە شۆڕشێکی فیکری لەو سەردەمەداو ، گۆڕانکاریەکی تەواو لە ناو خەڵکیدا ..

(١) الامام السرهندی ابو الحسن الندوی .

بە شاری (تھانیسر)دا تێپەڕ دەبن ، شێخ (سلطانی) والی ( تھانیسر ) ، زانایەکی پیاو چاك بوو ، بە پیریانەوە دەچێت و پێشوازیەکی گەرم و گوڕیان لێ دەکات و ڕێزیان لێ دەگرێت ، بە میوانی لە لای خۆی دەیان ـ هێڵێتەوە ، پێی خۆش بوو کچەکەی بە ئیمامی سەرھەندی بەخشێت ، باوکی ئیمامیش بەم خزمایەتیەی ڕازی بوو[1] •

(١) هەمان سەرچاوەی پێشو •

## ( خۆ پەروەردەکردنو بەیعەت بەستن )

[ ئەو ناوەندو سەردەمەی کە ئیمامی سەرهەندی تیایدا هەلسا بە نوێ کردنەوەو چاکردنی خەلکی ، تا لەو کاتەدا تەصەوف بە ڕەگ‌و ڕیشەی کۆمەلگای ئیسلامیدا چوو بووە خوارەوەو ، تێکەلاوی ناو خوێن‌و گۆشتیان بوو بوو ، تەصەوف بە ڕادەیەك لە نێویاندا بوو بوو بە زەوق‌و ئاکارێکی سروشتی ، کە لە لایان وەکو نیشانەو دروشمێکی ئاسایی لێ هاتبوو ، لەگەڵ ئەوەشدا تەنها بە چینێکی تایبەتیەوە نەبەسترابۆوە ، بەڵکو خەڵکی بە گشتی ئاوڕیان لە هیچ‌زاناو پەروەردیارو چاکە خوازێك نەدەدایەوەو تەنانەت هەر نرخیشیان بۆ دانە دەنا ، هیچ جۆرە خێرو چاکەیەکیان لێ بەدی نەدەکرد ، ئەگەر گوێی بە تەصەوف‌و سلوك نەدابایەو هاوڕێیەتی هەندێك لە شێخە ناسراوەکان نەکردبایەو دەستی بە هەندێك لەو ڕێگا باوانەی لە ناو خەڵکی ئەو کاتەدا مەقبوڵ بوو نەگرتایە ، کەڵکیان لە ئامۆژگاری‌و نوسینەکانی وەرنەدەگرت .

**« هەروەها شۆڕشی ڕاستەقینە لە سەر خوتبەی سەرنج ڕاکێشەر زۆری زانیاری‌و فراوانی ڕۆشنبیری پێك نایێت ، گەر لە پشتی ئەمانەوە دەروونێکی خاوێن‌و لە خواترس‌و ، دڵێکی پڕ لە ئیخلاص‌و**

بەخێنلدار نەبێت ، ئەو دڵەی کە بۆ حاڵی موسڵمانان بێشێتو غەمبارو
دڵ پەرێشان بێت بۆ ئەو بارە ناڵەبارەی بەسەر ئایینا هاتووە .. ئەم
سیفەتانەش بـــە هۆی زۆری زیکرکردنو پەرستشو هاوڕێیەتی
پیاوچاکانو شوێن پێ هەڵگرتنی لە خوا ترسان نەبێت پەیدا نابێت
زۆر هەن ئاوانە خوازن کە ئەو وەزعەی هەیەو ، دامەزراوەو لەسەردەمیدا
پەیدا بووەو خۆی گرتووە بیخوڕێنو ، ئەو کۆمەڵگایەی کـە خراپەکاری
تیدا بەرو بۆنەوەو هۆکاری خراپەو خاپورکردن تیایدا ســەری هەڵداوە
چاکی بکەنو ، هەوڵ دەدەن ئەو دەورو بەرو ناوەندەی بـە زانای
مەزنو مامۆستای پلەبەرزو ئەدیبو شاعیری پێگەیشتوو دەوڵەمەندە،
کاری تێبکەن ، کەچی هیچیشیان لەوان زیاتر نیەو ، ئـەو تینەووەی
کە لەبەر دەستی ئەواندایە هەر دەست بۆ ئەوانە درێژ دەکەنو بەڵـکو
لە هەندێ لایەنی زانستیو فەزیلەتەوە هــەر ئەوان لەوان بەرزترن
جگە لەوەش شتێکی وایان نیە تا ئەوان ئاتاجی بێنو دواکــەوتووی
خۆیانی پێ بزانن و بڕیاری ئـەو دواکەوتنەی خۆیانی پێبدەن .. ئـەو
شتانە وەك بوونی پەیوەندییەکی بەتین لەگەڵ خواداو ، ناسینی داوو
پیلانەکانی شەیتانو گەیشتن بە پلەی بەرزی ئیمانو ، دەستگرتنی بە
شەریعەتو سوننەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلمو دوورکەوتنەوەی
لە ئارەزووبازیو ، دەم گرتنەوەی لە خواردنی دونیاو ، بێ نرخ کردنی
دونیا پەرستیو ڕووکردنی بەرەو ئاخیرەتو ، شارەزایی لـــە لایەنی
دەروونو عەقڵی ئادەمیزادو ، ناسینی کەمو کورتی خاڵی لاوازی فیکریو
هۆشی خەڵـکیو ، قۆناغی تێگەیشتنو پلەی مێژوویی ئەو کۆمەڵگایەو ،
شارەزایی لە قۆناغەکانی مێژوویی ئەو بیروباوەڕەی کـە دەیگەێنێت.
جا ئەو کەسەی کە هیچی لەمانە پێ نەبێتو بیەوێت بەم کـارە مـەزنە
هەڵسێت وەکو ئەو کەسە وایە کـە دەچێتە مەیدانی جەنگەوەو ، بێ

**ئەوەی شارەزایی سەربازانەی هەبێت هیچ چەشنە مەشقێکی کردبێت ، سەرەڕای ئەوەش دەچێت بەگژ سوپایەکی مەشق پێ کراوو ، دەوڵەمەند بە چەکو تفاقو هەموو هۆیەکی جەنگ‌کردن ، کەچی ئەمیش بێ چەکو بێ هێزە ، یان ئەوبەرەکەی چەکو تفاقی وەکو ئەوانی پێیە ، بـەلام چونکە مەشقی نەکردووەو لێی نازانێت ، وەکو ئەو کەسە لالەی لێ دێت کە دەیەوێت قسە بـکاتو خەڵکی فێر بکاتو تێیان بگەیێنێت ، بێگومان هیچی پێ ناکرێت ) (١) .**

ئیمام هـەر بەوەندەوە نەوەستا کـە زانـست لــــە زاناکـان وەربگرێتو لــە پێناویدا تێ بکۆشێت بەڵـکو بلیمەتیو زانایەتی ئــەو لەوەدا بوو کـە بتوانێ بە هۆیەوە بـکاتە پلەی پێشەوایەتیو ئیجتهـــاد کردنو ، بەهرەمەندی ئەو لەوەدا بوو کە توانی گۆڕانکاری لە ڕەگو ڕیشەوە لەناو کۆمەڵدا بـکاتو بەرەو چاکەیان بەرێت ، کاتێك بەم کارە مەزنە ڕابەری ؟ ئامادەیی خــۆی بە هـــەموو تفاقو پێویستی‌یەکەوە وەرگرتبوو ، لەگەڵ متمانەو توانایی‌یەکی تەواوەوە ، تلوەکو شوێنەواری بانگەوازەکەیو بزوتنەوەکەی لەو سەردەمەدا کاریگەر بێتو ، لــــە هەموو ناوچەو شارو وڵاتێکدا بەرەو ئاسۆ بکشێت .

( کاتێ ئیمام چووە ( سەرهەند ) وازی لە هەموو گەشت کردنێك هێناو پشتێنی لێ‌کردەوە ، هــــەر بەم جەشنە مایەوەو خزمەتی باوکی دەکـــــرد ، تا باوکی وەفاتی کرد ، فەیضی ڕۆحی زۆری لـــە باوکی وەرگرتو بەرەو پلەی ( ئیحسان ) ڕێی گرتە بەر ، لەم ڕێ گرتنەیدا شوێن بەرنامەی جەشتیو قادرییەکان کەوت ، جـــگە لـــەمەش بە بەردەوامی خەریکی خوێندنی زانستی‌یە ئاینیەکان بوو ) (٢)

سۆزو کزەی دڵی بۆ ماڵی خواو زیارەتی پێغەمبەر ـ صلی اللە علیه

---

(١) الامام السرهندی ابو الحسن الندوی .
(٢) بروانە هەمان سەرچاوە .

وسلم ـ تەنگی پێ هەڵچنیبوو ، جۆشی پێ سەندبوو ، خەمو لە چاوەکانی زڕابوو ، شەوق‌و پەرێشانی بە سەریدا زاڵبوو بوون ، بەڵام لەبەر پیری باوکی‌و نزیك بوونەوەی مردنی ، بەلایەوە شیاو نەبووە لە سەر ئەم حاڵە بەجێی بهێڵێت •

ساڵی ۱۰۰۷ی ك کە باوکی تیایدا وەفاتی‌کرد ، ئیتر هیچ بەربەستێك نەما ڕێی ئەو گەشتەی لێ بگرێت • بۆیە تویشووی سەفەری هەڵگرت‌و ، ساڵی ۱۰۰۸ی ك بەرەو ماڵی خوا ، سەرهەندی بەجێهێشت‌و ، چووە (دەهلی) ، زاناو پیاوچاکانی ئەو ناوچەیە ، دەربارەی چاکەو فەزڵ‌و زانایەتی‌و لێ هاتوویی ئەویان بیستبوو هەموویان بەرەو پیریەوە هاتن‌و پێشوازیەکی گەرمیان لێ‌کرد • • یەکێك لەوانەی پێشوازی لێ‌کرد شێخ ( حسن الکشمیری ) بوو کە لەوەو پێش ناساویان هەبوو •• کەوتنە گفتوگۆ کردن لە ناو خۆیاندا تا باس هاتە سەر باسی شێخ (عبدالباقي)و ، پایە ـ بەرزی‌و شکۆداری‌و هێزی دەروونی ، ئەم شێخە ، ئیمامی سەرهەندی زۆر جار ناوی ئەم شێخەی لە باوکی بیستبوو کە باسی تەریقەتی نەقشبەندی بۆ دەکردن ، بۆیە ئەمیش زۆر ئارەزووی بوو و ، حەزی دەکرد چاوی بەم شێخ (عبدالباقي)یە بکەوێت ، وا هەستی دەکرد کە تویشووی ئەم گەشتەی لەم هاوڕێیەتیەدا دەست دەکەوێت ، بۆیە ئەمەی بەنیمەتێك دەزانی‌و نەیدەویست لە دەستی دەرچێت • ئەمجا هەردووکیان ـ شێخ حەسەن‌و ئیمام ـ بەیەکەوە چونە لای شێخ (عبدالباقي)و هەروەکو زمانی حاڵی بڵێت ( ذلك ما کنا نبغ )[۱و۲] •

---

(۱) ئەمەیە کە ئێمە بە شوێنیدا دەگەڕێین •
(۲) رجال الفکر والدعوة الامام السرهندی ابو الحسن الندوی •

( شێخ عبدالقادر پیاوێـکی بە سۆزی خاوەن چێژو چەشە بـوو ، ئاکار بەرزو بێ فیز بوو ، خۆی بە شیاوی ڕابەریتی نەدەزانی هـــەر کەسێك بهاتایەتە لایو داوای تـــەریقەتی لێ بکردایە پێی دەووت هیچم لەم بابەتانە لا نیـە ، باشتر وایە لای یەکێکی تر بـــە دوایدا بگەڕێت ، گـەر دۆزیتانەوە بە منیش بڵێن خزمـــەتی میوانەکانی زۆر دەکردو هەولی دەدا دڵیان کەمەندکێش بـکاتو ، بە پێی پێویستیش نەبوایە قسەی نەدەکرد ، لە ڕوون کردنەوەی ڕاستیو چـــارکردنی گیروگرفتدا بە چاکیو جوانی هەولی دەدا ، تا خاوەن گیروگرفتەکـە لە ڕێـگای ڕاست دەرنەچێت )[١] .

یەکێ لـە سیفەتە جوانەکانی ئەوە بوو کە زۆر بە بەزەیی بوو تەنانەت لەگـەڵ گیانداراتیشدا . لە یەکێك لە شـــەوە ساردەکـــانی زستاندا لە خەو هەڵدەستێو لە ناو جێگاکەیدا دێتە دەرەوە ، کە گەڕایەوە دەبینێ وا پشیلەیەك لە ناو لێفەکەیدا خەوی لێ کەوتووە ، ئەمیش پێی خۆش نەبوو لە خەو ڕایبەڕێنێو دەری بـکات هەروا وازی لێ هێنا تا بەیانی ڕۆژ بۆوە . جارێکیان لە لاهور بوو ، برسێتی بڵاو بوو بۆوە ، لەو ماوەیەدا لە ناو خەڵکی شتێکی وای نە خوارد کە ناوی خواردن بێت . جا زۆر خۆی بە تاوانبار دەهاتە بەر چـاو ، هەرگیز خۆی لە خەڵـکی بە باشتر نەداوەتە قەڵەم ، دەڵێن لاوێك دراوسێی دەبێ ، ئاکــــار ناشیرینو خراپەکار دەبێو زۆریش فاسق بووە ، لەگەڵ ئەوەشدا شێخ کـە پێی دەزانی ، هیچ قـسەی نەدەکرد ، خۆی دەگرتو ئاشکرای نەدەکرد ، جا ( خواجە حسام الدین الدهلوی ) کە یەکێك بوو لە هاوڕێکانی شێخ پێی دەزانێو ئاشکرای دەکـاتو ڕاپۆرتی حاکمی دەکات تا جارێـــکی

---

(١) هەمان سەر چاوە .

تر شتیوا نەکات ، ئەمجا گرتیانو بەرەو بەندیخانەیان برد ، کە شێخ بەمەی زانی زۆر لە هاوڕێکەی توڕە دەبێو پێی دەڵێ تۆ بۆ ئـــەم کارەت کرد ؟ ئەویش لــە وەڵامدا وتی گەورەم ئەوە کابرایەکی بێ ڕەوشتو خراپەکارەو گوێ بە هیچ نادات و هــەموو تاوانو گوناهێك دەکات شێخیش دەڵێ : داخەکەم ؟ وا دیارە ئێوە خۆتان بە پیـاو چاكو لە خواترس دەزانن بۆیە وا خــراپی ئەو دەبینن ، دەنا ئێمــە هیچ جیاوازیەك ناکەین لە نێوان ئەوانو خۆماندا ، چۆن وازمان لــە نەفسی خۆمان هێناوەو ئەویش بەرەو فەرمان ڕەوا ڕاپێچ دەکەین ، پاشان چووە لای فەرمانبەرانو لە بەندیخانە هێنایە دەرەوەو ڕزگاری کرد ، ئەمجـا ئەم لاوەش تۆبە دەکاتو دەبێتە یەکێك لە پیاوچاکان ..

( ئەگەر خراپیو ناڕێـکی یەکی لە هاوڕێـکانی بدیبایە دەیوت ئەمە خراپی خۆمانە وا لەواندا ڕەنگ دەداتەوە ) ][1] .

شێخ (عبدالباقي) ساڵی ١٠١٤ك لە شاری دەهلی کۆچی دوایــی کردووە . نوسراوەکانی شێخ عبدالباقی ئەمانە بوون :ـ

١ ـ الرسـائل البديعــة .

٢ ـ المــكاتيب العليــة .

٣ ـ الأشعار الرائعة لەوانە ( سلسلة الاحرار ) کــە چوارینەکانی بە فارسی تێــدا شــەرح کردووە .

---

(١) سود لە (رجال الفكر والدعوة) وەرگیراوە .

## بەیعەتو دەروون پێ گەیاندن :ـ

[ ئیمامی سەرهەندی کە دەچێتە لای شێخ عبدالباقی هەر دەڵێی هــەردووکیان لەســەر وادە بوون ، ڕێزێــکی زۆری لێ دەگرێو پێشوازیەکی گــەرمی لێ دەکات ، سۆزو خۆشەویستی خۆی زۆر بۆ دەردەبڕێ ، شێخ پلوێــکی زۆر دەروون بەرزو بەشانو شەوکــەت بوو لە ناسینی خەڵــکیو هاوڕێیەتیدا هیچ پەلەی نە دەکرد ، ســـەرنجی خەڵــکی هەرگیز بۆ لای خۆی ڕانەدەکێشا ، بەڵام لەگەڵ ئیــــمامی سەرهەندیدا بە پێچەوانەوە بوو ، وا دیار بوو ویستی خودا لەوەدا بێت کــە ئیمام لەم هاوڕێیەتیەیدا تەواو پێ بــگاتو ، کەڵك لــە تەریقــەتی نەقشبەندی وەربگرێت کە لەو سەردەمەدا باو بووو ، هێزو پێزی تیــدا بوو ، تا بتوانێ لە ڕێــگەی ئــەو پەروەردەو سلوکەوە تەریقەتیش بخاتەوە ژێر ڕکێفی شەریعەت .. ئەمجا خەڵــکی پەروەردە بــکاتو ، بەرەو پلەو پایەی بەرزیان بباتو بەرەو ئاسۆی ئیمان سەریان خــات .. بۆیە شێخ پێی گوت ـ بە پێچەوانەی دابو نەریتی خۆی ـ « مانگێك یان بەلایەنی کەمەوە هەفتەیەك لە لامان بمێنەرەوە » .

ئیمام ئــەم داوایەی شێخ عبدالباقی بەدڵ بوو ، چونــکە خۆی بە شوێن دەلیلو ئاوی حەیاتو ڕووباری سەلسەبیلدا دەگەڕا ، مــاوەیەك لەوێ دەمێنێتەوە ، شەوقو لەزەتو خۆشی مانەوە زیاتر بە سەریدا زاڵ دەبێو حەز دەکات زیاتر بمێنێتەوە چونــکە گەیشتە ئەو قەناعەتەی کــە پێویستە تەریقەتی نەقشــبەندی بــکاتە سەرچاوەی ئیمانو کانیاوی ژیانی گیــانی ، بۆیە زۆر بە پەرۆشەوە داوای لە شێخ کرد ، بەیعەتی لەگەڵدا بەستێت ، شێخ ئەم داوایەی ئیمامی بەبێ چەنو چوون قبوڵ کـــرد

ئەمجا بردیە خەڵوەتـگاکەی خۆیو فێری زیـکری دڵی دەکرد ، بۆیە دڵی ئیمام هەر لەو ساتەوە دەستی بە زیکرکردن کرد ، لەزەتێـکی سـەیری هەست پێ دەکردو ، ڕووناکیـەکی زیادی تیا دەدیو ، ڕۆژ بە ڕۆژ لـە هەوای ڕۆحیـدا بەرزتر دەبۆوە .. شێخیش هـەستی بەمانە دەکردو دەیزانی وا بەم خێراییە بەرەو خوای گـەورە بـەرز دەبێتـەوە .

پاشان ئیمامی سەرهەندی دەچێتەوە سەرهەند ، شێخیش مـزدەی دەداتێ کە دەتوانێ نیـسبەتی تەریقەتی نەقشبەندی بەتەواوەتی بە دەست بهێنێت . بۆ جاری دووەم کە دەگەڕێتەوە بۆ دەهلی خەرقەی خەلافەتی لەبەر دەکاو ئیجازەی دەداتێ بۆ ئیرشاد کردن .

ئیمام بۆ جاری سێیەم دێتەوە بۆ لای شێخەکەی ، شێخ کە پێی زانی خۆی چوو بە پیریەوە تا پێشوازی لێ بـکات ، شێخ ئەمجارەیان خۆی ئیمام دەکات بە سەر خەتمەی زیکرو ئیرشاد کردن .. ئەمجا بە یاوەکانی خۆی فەرموو : ئیتر وا پێویستە هەر کاتێ ئیمام سەرهـەندی لێرە بوو ڕوو لەو بکەنو ڕوو لە کەسی تر نەکەن ، لەکاتی بەڕێ کردنی ئیمامدا بەرەو سەرهەند ، شێخ پێی وت : هەست بە لاوازیەکی زۆر دەکەم ، هیوام لە ژیان کەم بۆتەوە ، ئەمجا داوای لێ کرد کە ڕوویەکی دڵیو ڕۆحی بـکاتە هەر دوو کوڕە شیرە خۆرەکەیو دایکیان ئەمیش بە فەرمانی شێخەکەی هەڵـاو شوێنیو شوێنەواری ئەم ڕوو تێ کردنەیان تیـدا دەرکەوت [(١) .

---

(١) سود لە ( رجال الفكر والدعوة ) وەرگیراوە .

## شایەتی شێخی ڕابەر لە سەر گەورەیی‌و مەزنی ئیمام :

شێخ عبدالباقی بۆ هەندێ لە هاوڕێیان‌و دڵسۆزانی خۆی دەربارەی ( ئەم پەیوەندیە ڕۆحیەی لەگەڵ ئیمامدا ) دەنوسێ

« ئـەو شێخ ئەحمەدەی خەڵـکی سەرهـەندەو ، زانایەکی خواپەرست‌و پڕ لە زانست‌و کردەوە بەرزە ، هاوڕێیەتی منی هـەزاری بۆ ملوەیەکی کەم کرد ، ئەم هەزارەش زۆر ئەحواڵی سەر سوڕهێنەروە سیفاتی جوان‌و پلەو پایەی پڕ بایەخی لێ دی ، ئاواتە خوازم چـرایەك بێت‌و گشت جیهان ڕۆشن کاتەوە ، من زۆر متمانەو باوەڕم بە ئەحواڵی تەواوی هەیە »[1] .

ئیمـام هەرچـەندە پلەی بەرزتر بۆوە لـە شێخەکـەی بەڵام هەمیشە مل کـەچی بۆ شێخەکەی نواندووەو بێ ئەدەب نەبووە لـە ئاستیداو خۆی بەرزترو زاناتر لـەو نەداوەتە قەڵەم .. لەگەڵ ئەوەشدا مامەڵەو هەڵس‌و کـەوتی شێخ لەگەڵ ئیمامدا وەکو مامەڵەی شێخ‌و مرید نەبوو .. بۆیە ڕۆژێکیان دەربارەی ئیمام فەرمووی : « ئەحمەد خۆرەو، لە ئاستی تیشکی ئەو خۆرەدا بە هەزاران ئەستێرەی وەکو مـن ، ئـاوا دەبن » .

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشو .

## نیشتەجێ بوونی نیمام لە سەرهەند :

[ نیمام پاش ئەم کەڵک وەرگرتن و ، پەروەردە ڕۆحی و ، تەواو کردنە دەروونیەی لە سەرهەندا باڵی لێ دایەوەو ، بۆ ماوەیەکی زۆر پەروەردەو ئیرشادی کەسی نەدەکرد ، چونکە لە ناخیەوە هەستی بە کەم و کوڕی دەکرد لە خۆیداو ، بە خێرایەکی سەر سوڕهێنەر پلەکانی خۆ تەواو کردنی دەبڕی و بەرەو کەماڵ سەردەکەوت ، ڕۆحیشی زۆر بە ناسەوە بوو کە بگاتە ئەوپەڕی ئامانج و ترۆپکی بەرزی ، جا لەبەر ئەم حاڵەی ، بە لایەوە زەحمەت بوو ئەم لەم حاڵەدا بێت و لە هەمان کاتیشدا خەریکی پەروەردەکردنی مریدان و فێرکردنی قوتابیان بێت ، لە یەکێك لە نامەکانیدا دەڵێ :ـ

من لەم حاڵەدا بووم ، کە کەم و کوڕی خۆمم بۆ دەرکەوت ، دۆستانی تەریقەتیش لێم کۆبوونەوە ، بەڵام من ئەم کەم و کوڕیەی کە هەستم پێ دەکرد بۆم باس کردن ، لەبەر ئەوە ڕەوانەم کردنەوە بۆ جێی خۆیان ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم موریدو دۆستانی تەریقەتە ئەمەیان بە تەواضع لە قەڵەمدا ، ڕای خۆیان بەرامبەرم نەگۆڕی ، تا خوای گەورەش منەتی خۆی بە سەر مندا باران ، چونکە خوای گەورە

دەیویست من خزمەتی ئەم ئاینە بکەم‌و ، بیمە خەمخواری موسلمانان ، ئەو حاڵەی پێویست بوو پێی بەخشیم ][1] .

کەواتە ئیستا ، کاتی کاری چاکردن‌و پەروەردە کردنەکەی هاتووە ، بۆیە دەستی کرد بە ئیرشادی دۆستانی تەریقەت ، بە ڕێ‌کردنی موریدان‌و ، بۆ گەیاندنی ڕێکرانی تەریقەت .. ئیمام هەواڵ‌و دەنگ‌و باسی خۆی‌و موریدو برایانی تەریقەت‌و ئەو هەنگاوانەی ناویانەو ئەو پلانەی بڕیویانە ، هەمووی بۆ پەروەردیارەکەی خۆی شیخ عبدالباقی دەنووسی ، ئەو شتانەی لەو ئەنجامەدا دەیزانی‌ؤ دەیبینی‌و هەستی پێ دەکردو دڵی فێنك دەکردەوەو دڵخۆشی دەکرد ، دەیزانی ئەمە بەلگەیە لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە بۆ کارێکی مەزن ئامادەی دەکات .

(۱) سود لە هەمان سەرچاوەی پێشوو وەرگیراوە .

## گەشتەکەی بەرەو لاهور :

[ پاش ئەوەی ئیمام بۆ ماوەیەکی کەم لە سەرهەندا دەمێنێتەوە بە فەرمانی شێخەکەی دەچێت بۆ لاهور ، لەو کاتەدا شاری لاهور لە دوای شاری دەهلی دادەنرا بە مەڵبەندێکی ئاینیو زانستی ، ژمارەیەکی زۆریش لە زاناو پیاوچاکانی تیدا بوو کاتێ کە زانیان ئیمام هاتووە، هەموویان بە جارێ بەرەو پیری چوونو پێشوازیان لێ کرد ، ئەمجا شێخ ( طاهر اللاهوری ) بەیعەتی لەگەڵدا بەستو بوو بە جێاکرین خەلیفەی ئیمامی سەرهەندی . پاش ئەم شێخ ( حاجی محمد )و شێخ (جمال الدین القلوی) بەیعەتیان پێ‌کردو بوون بە یەکێك لە مریدەکانی، هەر لەوێدا حەڵقەی زیکرو ، کۆڕی خوێندنو ئامۆژگاریو ئیرشاد کردنی دەگێڕا ][1] .

## چۆنیەتی بانگەوازو پەروەردەکردنەکەی

[ ئیمامی سەرهەندی سالی ۱۰۲۶ك ژمارەیەکی زۆری لە خەلیفەکانی خۆی بۆ زۆر لە ناوچەکانی وڵات نارد بۆ پەروەردەکردنو بانگەوازیو ڕابەریکردن .. حەفتا کەس بە سەرۆکایەتی شێخ (محمد قاسم)ی بۆ تورکستان نارد ، بە سەرۆکایەتی شێخ (فرخ حسین)

(۱) الامام السرهندي ـ ابو الحسن الندوي .

چل کەسی بۆ وڵاتانی حیجازو یەمەنو ڕۆمو شام نارد .. دە کەسی لـە ئەوره پیاوانیو تێکەیشتوانی تەریقەت بە سەرۆکایەتی شێخ ( محمـد صادق الکابل ) ناردە کاشغەر .. سێ خەلیفەش لە خەلیفەکانی خۆی بە سەرۆکایەتی شێخ ( احمـد البرکي ) نارد بۆ تورانو بەخشـانو خوراسان .. ئەو کەسانەی ناردنی بۆ ئەو ناوچانەی پێیان سپێردرابوو، هەموویان سەرکەوتنێکی تەواویان بەدەست هێنابوو ، خەڵکێکی زۆر لەسەر دەستیان تۆبەیان کردووە ، دوبارە بە ڕێگای ڕاست ئاشـا بوونەوە .. زۆری تریش لە زانایانو پیاوچاکان لە زۆر لای ناوچەکانی ترەوە ، ڕوویان کردە سەرهەندو خۆیان گەیاندە ئیمـام ، بەیعەتیان لەگەڵ ئیمامدا بەستو کەڵکێکی زۆریان لە پەروەردەو هاوڕێیەتیەکەی وەرگرت ، هەندێك لەوانەی کە هاتبوونە لای ئەمانە بوون :

١ ـ شێخ ( طاهر البدخشی ) کاتبی تایبەتیو جێگـه بلاوەی بدرخسان بوو .
٢ ـ شێخ ( عبدالحق شادماني ) .
٣ ـ شێخ ( صالح الكولابي ) .
٤ ـ شێخ ( يار محمـد ) .
٥ ـ شێخ ( احمـد البرسي ) .
٦ ـ شێخ ( يوسف بن طالقان ) .

ئیمـام ڕێزی لە هەموویان گرتو ، ئیجازەی دانیو کردنی بـە خەلیفەی خۆی ، فەرمانی پێدان ، کە بگەڕێنەوە بۆ ناوچەکانی خۆیانو خەریکی بانگەوازیو پەروەردەکردنی خەڵکی بن .

لە هەموو لایەکی هیندستاندا خەلیفەو قوتابیەکانی خۆی دامەزراند، پاش ئەوەی شێخ ( میر محمد نعمان )ی کردە خەلیفەو ئیجازەی دانی

ناردیە (دکن) ، لە گۆشەکەیدا بە سەدان لە سوارەو پیادە بۆ زیکرو خواپەرستی کۆدەبوونەوە .. شێخ ( بدیع الدین السهانپوری )ی ناردە (سهارنپور) لە یەکەمجارداو ، فەرمانی پێدا کە لە تۆردوگای (پاشایی) لە ( ئاگرە ) بمێنێتەوە ، ئەم کارەی بۆ رەخساو ، خۆشەویستی‌و شکۆداری بەرامبەری لە ناو دڵی خەڵکیدا ڕوا . زووربەی ئەندامانی ئەم دەوڵەتە بوونە مریدی‌و جونە ریزی حەڵقەکەیەوە ، بەهەزاران پیاوانی عەسکەری لەسەر دەستی تۆبەیان کرد ، هەموو ڕۆژێ خەڵکی ئەمەندە ئاپۆرەیان دەکرد ، بەڕادەیەك زۆر بە زەحمەت دەبوو کە میرو پیاوانی دەوڵەت زیارەتی شێخ بکەن ، شێخ (میر محمد نعمان الکشمي) کە خەلیفەی شێخ ( عبدالباقي ) بوو بەیعەتی لەگەڵدا نوێ کردەوەو ئیجازەی دایێ‌و لە ناوچەی ( بورهانپور ) دایناو ، بووە سەرچاوەیەك بۆ بڵاوکردنەوەی تەریقەت‌و موریدان ، باری دەروونی زۆربەی خەڵکی چاك بوو ، تۆبەیان دەکردو لە گوناه کردن وازیان دەهێنا . شێخ ( طاهر اللاهور )ی ناردە شاری لاهور کە مەڵبەندێکی زانیاری‌و ڕامیاری بوو لەو سەردەمەدا ، تا ڕانمایی قوتابیانی زانیاری بکات‌و تینوویەتی تینوانی یەقین بشکێنێ ، کەڵك‌و سودی لەو ناوچانەدا تەشەنەی کرد ، ئەمجا ئیجازەی دا بە شێخ ( نور محمد البتی )و ناردیە شاری (بتە)و ئەمیش دەستی کرد بە دامەزراندنی زنجیرەی پەروەردەو ڕابەری کردن‌و ، دەرس وتنەوەو سودگەیاندن‌و بانگەوازی‌و پاشان ناردی بۆ (بنگالە) . ئەمجا شێخ ( طاهر البدخشي ) پاش ئەوەی خولی پەروەردەیی تەواو کرد ، ئیجازەی دایێ‌و ناردیە شاری (جونپور) بۆ دەرس وتنەوەو تەریقەت دان .

پاش ئەوەی ئیجازەی دا بە ( شێخ احمد البرکي ) ناردی بە

(برك) بۆ پەروەردەو ڕاسایی کردنی ئەو ناوچەیە .. شێخ (عبدالحي) کسە خەڵکی ناوچەی ( حصار شادمان )ی ولاتی ئەصفەهان بوو ، پاش تەواو کردنی خولی خۆی لە پەروەردەو ڕاسایی کردن ، ئیجازەی دایێو ناردی بۆشاری (پتنە)[1]و تاسەی ئیتویەتی ئیرانی تەریقەتو زانستی شکاندەوە ، شێخ ( نور محمد ) لە ڕۆخی ڕوباری (کنکار) سەرچاوەی ئاوی ڕوونی هیدایەتو پەروەردەو سود گەیاندنی هەڵ قوڵاند . شێخ ( حسن البركي ) بە فەرمانی شێخ ولاتەکەی خۆی گرتبووە ئەستۆی خۆی بۆ بلاوکردنەوەی ( سنە )و نیشاندانی ڕێگای ڕاستی . سعید ( محب الله المانكبوري ) کرد بە خەلیفەو ناردی بۆ ( مانکبور ) پاشان ڕێگای دا لە (ئلباد) بمێنێتەوە ، شێخ ( کریم بابا حسن ) ڕێزێکی زۆری لێ گیراو سۆزێکی زۆری پێ بەخشراو تیشکی دڵی زۆر بە کەڵکی تێ گیرا لە لایەن ئیمامەوە ، پاشان گەڕایەوە بۆ ولاتەکەی خۆی ][2] .

ساڵی ١٠٢٧ك کۆتایی پێ نەهاتبوو ، کـــە ناوبانگی ئیمـــامو شکۆداریو شانو باهویو کاریگەریتی پەروەردە کردنەکەی هێـــزی ئاراستەکردنو ڕابەری کردنەکەی بـــە هەموو لایەکدا بلاو بۆوە تا گەیشتە دەرەوەی ولاتیش ، سەدای ئەم پیاوە مەزنە گەیشتە ئەو دیوی ولاتی هیندستانیشەوە بۆیە لە هەموو لایەکی جیهانەوە تاکە تاکەو پۆل پۆلو بە کۆمەڵ خەڵکی ڕووی تێ دەکردو ، ســودیان لـــە پەروەردە

---

(١) لەوەو پێش ( نور محمد البتني ) نارد بۆ (بتنە) دوبارە شـــێخ (عبدالحي) ناردووە ، وا دیارە شێخ نور قوتابێکی بە خەڵـــکی بریوەو تا ئەمیش ( شێخ عبدالحي ) قوتابێکی تربان پێ ببرێت. بۆیە ئەمیشی دوبارە ناردووە .

(٢) الامام السرهندي - ابو الحسن الندوي

کردنەکەی‌و زانستەکەی وەردەگرت ، زۆر لە خەلیفەکانی گەیشتبونە ( ما وراء النهر )و ( بدخشان )و (کابل)و ولاتەکانی تر ، ناوبانگیشی گەیشتە ولاتە عەرەبیەکن ، بەلام لە هیندوستاندا جێگایەك نەمابوو ، خەلیفەو قوتابی‌و ، مریدی ئیمامی تیدا نەبێت ، هەموویان بە جاری بانگەوازیان بۆ ڕێگەی خودای گەورە دەکرد ، ڕاستەشەقامیان نیشانی خەلکی دەداو قوتابیان پەروەردە دەکرد(١) .

ئەگەر وردبینەوە لەم شێوە بانگە وازیەی ئیمامی سەرهەندی ، دەزانین کەم کەس هەیە لە مێژووی ئیسلامەتیدا شان بدات لە شانی لەم شێوازەی کە هەلی بزاردبوو بۆ گەیاندنی ئیسلام‌و نوێ کردنەوەی لە دلی خەلکیدا .. لە پێشاندا خۆی پێ گەیاندو پلەی ڕۆحی‌و زانستی‌و ڕۆشنیری لە چاو سەردەمەکەیدا زۆر بەرزکردەوە ، ئەمجا توانی ئەو پیاوانەی کە خێریان تیدا بەدی دەکات لە خۆیانی کۆبکاتەوەو ، جگە لەوەی مریدو قوتابی پەروەردە کردو پێی‌دەگەیاندن .. پاشان ڕێگەی دەدان ئاینی ئیسلام بلاو بکەنەوەو بەخەلکی بگەێنن . . چونکە ئەگەر یەکێك خۆی هیچی پێ نەبێت چی ببەخشێت وەك ئەو وتەیەی دەلێت (فاقد الشيء لا يعطيه) هیچ پێ نەبوو ، هیچ نابەخشێ.. ئەمجا ئەگەر ورد بینەوە شێوە ڕێکخراوێکی ڕێك هێنا بوو هەموویان لە فەرمانی ئەو دەرنەدەچوون .. خۆی ئاراستەی دەکردن ، تەك هەر خەلیفەو موریدێك بە ئارەزووی خۆی شت بکەێێت .. لەگەل ئەوەشدا سەربەستی جولانەوەو چۆنیەتی گەیاندنی بەرنامەکەی درابووە دەست خەلیفەو بانگەوازان خۆیان ، بەلام ئەویش بەگەیاندنی یەك بەرنامە ..

---

(١) رجال الفكر والدعوة . الإمام السرهندي . ابو الحسن الندوي

یانی خەلیفەیەك لەوسەر وڵاتو ئەمی تر لەو سەری وڵات یەك شتیان گەیاندووە بە خەڵکی .. بێ گومان ئەمە جوانترین کاری ڕامیاریانەیە ، کە ئاراستە کردن مەڵبەندی بێت کاریش ناوچەیی بێت بە مانای ئەو ڕێسایەی دەڵێت :-

« التوجيه المركزي والعمل اللامركزي »

# هەلوێستی سولتان جیهانگیر بەرامبەر بە ئیمام

[ جلال الدین اکبر ] ساڵی ۱۰۱۴ی‌ك دەمرێو ، ( نور الـــدین جیهانگیر )ی کوڕی لەسەر تەختی پاشایەتی دادەنیشێ ، ئەو نەگبەتیو بەڵایەی لە سەردەمی ( ملك الاکبر )دا بە سەر ئیسلامو موسڵمانەکاندا هاتبوو ، ئەو بارە نالەبارەی موسڵمانان تێدا دەژیانو ، دەچەوسێنرانەوەو ئەو هەوڵانەی دەدرا لــە پێناوی ڕیشەکێشکردنی ئەملی ئیـــسلامو ، کێشانی نەخشەو پیلان گێڕان بۆ ئەم مەبەستە ، لەم وڵاتەی ، کە بەخوێنی تێکۆشەرانی ئیسلام زەمینەکەی ئاو دراوەو بەئارەقی بانگکەرانو چاکــە خوازانو فرمێسکی ئەولیاو پیاچاکان ، تۆوی ئیسلام تیـــایدا گەشــەی کردووە ، ئەمانە هەمووی بەس بوون بۆ ئەوەی دڵی ئیمام خەفەتبـــارو غەمبار بێو غیرەتی ئیسلامی تێدا بجولێو ، لە تاو ئـــەو بارە نالەبارە خەوو خۆراکی لێ حەرام بێ ‎..‎ بەڵام لەبەر ئەوەی لــە ســــەرەتادا خەریــکی پەروەردە کردنو خاوێن کردنەوەی ناخی خۆیو ، هەوڵی تەواو کردنی گــەشتە دەرونیەکــەی بوو ، بۆیە جوڵانەوەیەکی وای لێ بەدی ناکەین شایانی باس بێت ‎..‎ لەگەڵ ئەوەشدا دەیزانی کــە فیتەو خراپەکاری گەیشتبووە ئەو بەڕی ، جگە لەوەش هێشتا نەگەیشتبووە ئەو پێتەی لێیەوە دەست پێ بـکاتو ، لەوێوە بتوانێ تەئسیر لە خەڵکیو

فەرمانڕەواو لایەنی ڕامیاری وڵاتەو ڕژێم بسکات ، تا کۆمەڵــــگا بەرەو ئیسلام ئاڕاستە بسکات .. بۆیە لە سەرەتادا نوێکارو چاکە خوازیەکەی ئین و چستەو چالاکییەکی وای تێدا نەبووە کە هەستی پێ بسکرێت .. بەڵام ئەوەندەی لێی دەزانرێ ئەوەیە لەو ماوەیەدا (ئامۆژگاری نامە)ی بۆ (خان خانان)و ( سید صدر جهان )و ( مرتضی خان ) ناردووە ، ئـەم پیاوانەش نزیکترین کەس بوون لە سوڵتانەوەو جێی باوەڕو متمانـەی بوون ، دڵی ئـەم پیـاوانەش بەرامبەر بە ئیمام پڕ بوو لــە ڕێزو شـکۆو خۆشـەویستی .

ئەو جیاوازیەی لــــە نێوان سوڵتان جیهانگیرو ( ملك اكبر )ی باوکیدا بوو ئەوەیە ، کــــە جیهانگیر هیچ ڕقێـکی بەرامبــــەر ئیـسلام هەڵەگرتبوو ، بە هیچ جۆرێك بیری لە چەسپاندنی ئەو یاساو دەستورەی باوکی دانـابوو نەدەکردەوە ، بەڵـکو هەر خەریکی ڕابواردنەو خۆش گوزەرانیی و ئاهەنگ گێڕانو شەوگار بردنە سەر بوو . کاتێ کە (ئیمام ساکاری جیهانگیری بۆ دەرکەوت لە لایەن فیکرەو عەقیـــدەیەوە ) ، بڕیاری دا کــــە ئــــەم هەلە لە دەستی خۆی نەداتو ، تێ بکۆشێت بۆ نەهێشتنی ئەو شوێنەوارە نالــــەبارو نارەوایەی کــــە باوکی بەجێی هێشتبوو .

قەدەری خوا وای هێنا ئیمامی سەرهەندی پێش ئـەوەی دەست بەم شۆڕشە مەزنەی بسکات ، ڕووداوی بەندکردنەکەی هــــات بـــــە سەرا لە قەڵای (گوالیاردا) کە ئەم گرتنە لە مێژووی چاکە کـــاریو نوێـکاری ئیمامی سەرهەندیدا بە ڕووداوێـکی مێژوویی گرنـگ لــــە قـەڵەم دەدرێت .

شێخ ( بدیع الدین ) السهارنبوري ) کە ناوبانگی بڵاو بێۆوەو لەئەو

سوپای سولتاندا ڕەواجی پەیداکردبوو خەڵکی دەربارەی زۆریان قسە دەکردو ، مەسەلەی چوونی بۆ لای پیاوانی دەوڵەت زۆر گەورە کردبۆوە ، بۆیە لە بەرامبەر ئەم هەڵوێستەی (سهارنبوری) ترسیان لێ نیشتبو ، وایان لە سولتان گەیاند ، کە ئیمامی سەرهەندی دەیەوێت لە ڕێگەی (سهارنبوری) یەوە پەیوەندی لەگەڵ سوپادا پەیدابکەنو دژی دەوڵەت پیلان بگێڕنو دژی سولتان تەختەی شۆڕش دەکێشن .. لەگەڵ ئەم هەموو پڕوپاگەندانەی دژی ئیمامی سەرهەندیو (سهارنبوری) دەکرا ، ئەم هیچ گوێی بەم هەواڵو دەنگو باسانە نەداو بەڵکو بە پێچەوانەشەوە هەر خۆشەویستی خۆی بۆ ئیمام دەردەبڕیو هەمیشە لە لای خەڵکی باسی دەکرد ][1] . لەگەڵ ئەوەشدا دەبوایە ئەم تۆمەتەی لەسەر خۆی لابردایە نەك زیاتری بکات ، چونکە ئیمامی سەرهەندی هیچ مەبەستێکی ڕامیاریانە یان کودیتا نەبووە ، بەڵکو مەبەستی چاکەخوازیو چاکەکاری بووە ، کە پێویستە هەموو بزوتنەوەو جوڵانەوەیەکی ئیسلامی چاکە خوازو چاکەکار ، ئەم مەبەستەی خۆیان ئاشکرا بکەن ، ئەو تۆمەتە ڕامیاریانە لە خۆیان دوور بخەنەوە وەکو ئیمامی عومەر دەفەرموێ :-

« مَنْ عرض نفسه للتهمة فلا يلومنَّ مَن أساء به الظنّ »

جگە لەوەش بە گوێی فەرمودەکەی ئیمامی عەلی نەکرد کە دەفەرموێ :- « كلّم الناس على قدر عقولهم » [ بۆیە ئیمام بەم پڕوپاگەندەو ئاژاوە نانەوەیە کەوتە ناو گیروگرفتو ناخۆشیەوە - سولتان جیهانگیریش هیچ ئاگاو خەبەرێکی لەم کارەساتە نیە ، بەڵام

---

(1) هەمان سەرچاوەی پێشوو

سەر خوازان لە کۆشکی سوڵتاندا زۆر بوون ، ئیمامی سەرهەندیش لەو کاتەدا بەربەرەکانی بزوتنەوەی شیعەگەریتی دەکرد ، کە خەریك بوو بەسەر کۆمەڵگای ئیسلامو هۆش‌و بیریاندا زاڵ دەبوو ، جگە لەوەش ئێرانیەکان کە هاتبوونە هیندستان ، لە هەموو لایەکەوە دەستیان بەسەر کۆشکدا گرتبوو ، ئەمیش بە ئاشکرا بانگەوازی بۆ ئەهلی سوننەو جەماعەت دەکرد ، ئیتر لێرەدا هیچ دوور نیە کە ئێرانیەکانی خاوەن پلەو پایە ، لە کۆشکی پاشایەتیدا داخ لەدڵ بوون‌و ، بۆ هەلێك گەڕاون ، ئیمامی بێ لەناوبەرن .. ئەمجا مەترسی ئەم کارەساتە لەوێوە دەستی پێکرد کە بە ڤاڵێکی ڕامیاریانە درایە قەڵەم .. ئیتر سوڵتان لێرەوە بڕیاری دا سنورێك بۆ ئەم وەزعە دابنێت ][(١)] .

تا لەم کاتە ناهەموارەدا ئیمام بە پەروەردە کردن‌و ئیرشادەوە خەریك بوو ، هەر وەکو خۆر تیشکی بەخش دەکردو ، بە هەموو لایەکدا بڵاوی دەکردەوە ، لە هەموو لایەکدا ناسرا ، نوێنکاری‌و چاکەکاریەکەی گەیشتبووە ترۆپکی بەرزی‌و ، لە هەموو دڵێکدا جێی خۆی کرد بۆوە ، وا دیارە ویستی خوای گەورە لەوەدا بووە ، لەو کاتەی ئەو گەیشتبوو بە ئەو بەڕی پلەی بەرزی‌و مەزنی شێخایەتی‌و ڕابەری کردن ، تووشی ئەو تاقی‌کردنەوەیەی بکات‌و فێری ئەوەی بکات کە ئەو ڕێگەیەی گرتویەتیە بەر ، تەواضعانە بیگرێتەبەر تا بگاتە ئەو میعراجە ڕۆحی‌و خودا ویستی‌یەی کە بە بێ ئەم بەڵاو ناخۆشیانە نەبێت ، نایگاتێ .

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو

# هۆی بەندکردنی ئیمام لە قەلای کوالیاردا :

هۆی سەرەکی بەند کردنی ئیمام ، بۆ ئەو پەیوەندیە بەنیسە دەگەرێتەوە کە لە نێوان پیاوانی دەوڵەتو میرەکانی کوشتکو ئەمو خۆشەویستیو ڕێزەی لە لای ئەواندا هەیبوو ، ئەمەش خۆی لە خۆیدا هۆیەکە لەو هۆیانەی دڵ پڕ لە ڕقو قینە دەکاتو بەسە بۆ خرۆشاندنی ئەو سوڵتانەی دژی باوکی خۆی هەستاو ، شۆڕشێکی گەورەی لە دژیدا هەڵگیرساند ، جگە لەوەش بەربەرەکانی براکانی خۆی دەکردو هەندێکیشی لێ گرتن ، تا توانی تەختی سەڵتەنەت بۆ خۆی داگیر بکاتو کاروباری وڵات بگرێتە دەست ، سەرەڕای ئەمانەش لەوانەیە سوڵتان جیهانگیر ئاگای لەو نامە کاریگەرانەی ئیمام بووبێت کە بۆ پیاوەکانی دەنارد .. لەوانەیە هەر ئەم هۆیەش بووبێت پاش ئەوەی ئیمام لە بەندی قەلای کوالیار ڕزگاری دەبێت جیهانگیری وا لێ کردبێت ئەو داوایە لە ئیمام بکات بۆ ماوەی سێ ساڵ لە ئوردوگاکەیدا لەگەڵیدا بمێنێتەوە ، تا وەکو لە جۆنیەتی ئەو پەیوەندیە تێ بگات کە لە نێوان ئیمامو پیاوەکانیدا هەیە ، تا دڵ ئارام بێت کە هیچ مەترسیەکی لەسەر سوڵتەو دەوڵەت نیەو ، نایکات بە هەڵێك بەگژ دەوڵەتدا بچێت .

بەڵێ جیهانگیر دڵ ئارام بوو لە مەبەستو نیازی ئیمام کە ئەمەش لە هەمووی گرنگترەو پێویستە ئەو نیازە خاوێنو جوانەی چاکە خوازان هەمیشە ئاشکرا بێت بۆ سوڵتانەکان تا لێیان نەترسنو ، هەر لە سەرەتاوە بزوتنەوەکەی بنە بڕ نەکەن . پیاو چاکێتیو لە خۆبوردنی ئیمامی چاو پێکەوتو بێ تەماعیو ئاکار بەرزی دیو ، زانی هیچ جۆرە زەحێك بۆ پلەو پایەو کورسیەکەی دانێتو ، بە هیچ جۆرێك ئلوپڕشی لێنادانەوە . بڕیاری سەربەستی ئیمامی دەرکردو چۆن دەیەوێت با بژی .

بزانن چەند ساڵی کردە قوربانی بیروڕاکەی تا تۆمەتی ڕامیاری لە خۆی دوور بخاتەوە ، بەڵکو بەبێ کەفو کوڵو سنگ دەربەڕاندن ڕازی بوو بەو حوکمەی سوڵتان ، تا نیازی پاکی خۆی بۆ هەموو لایەك دەربخات(١) .

---

(١) لێرەدا بە پێویستی دەزانم چەند نمونەیەك لەم سەردەمەی خۆمان بێنمەوە چۆن تێکۆشەرانی ئیسلام هەمیشە هەوڵ دەدەن تۆمەتی ڕامیاریو دنیایی لە خۆیان دووربخەنەوە ئەوەتا مامۆستا سەعیدی نورسی نامەیەکی نارد بۆ سەرەك وەزیرانو وەزیری عەدلو ناوخۆیی تورکیا کە تیشکی خستۆتە سەر ژیانی خۆیو بزووتنەوەکەیو پەیامەکانی کە بەشێکە لەو بەرگریانەی لە خۆی کردووە لە دادگاکانی تورکیا ، هەندێکی لێرەدا دەنووسینەوە .. پاش باسی لە دایك بوونی خۆی ژیانی قوتابێتیو گۆبەن نانەوە لای سوڵتان عبدالحمید . ئەمجا باسی ئەوە دەکات چۆن بەشداری کردووە لە جەنگی جیهانی یەکەمو هەوڵ دانی بۆ دامەزراندنی قوتابخانەی ( الزهراء ) ، بەگشتی باسی هەوڵدانی ڕامیاری خۆی کردووە بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی ئیسلام ، پاش ئەمانە دەڵێت :

تا ئێستا ژیانم پڕ بوو لە خزمەت کردنی وڵات ، بە پێی ئەو بیروباوەڕەی هەڵم گرتبوو کە بریتی بوو لە خزمەتکردنی ئایین لە ڕێی سیاسەتەوە . بەڵام پاش ئەم ماوەیە بە تەواوەتی ڕووم

. . . . . . . .

---

لە دونیا وەرگێڕاو سەعیدی کۆنم خستە گۆڕەوەو بووم بە مرۆڤێکی نوێ کە بۆ ئاخیرەت بژی ، لە کۆمەڵ هاتمە دەرەوەو لە گردی ( یوشع ) لە ئەستەنبول گۆشەگیر بووم ، پاشان لە ئەشکەوتەکانی ناوچەی وان لە بەتلیسدا لە تێکۆشانێکی بەردەوامی ڕۆحو ویژدانمدا بووم ، بۆ جیهانی ڕۆحم خۆم بە تەنها هێشتەوەو دروشمی ( اعوذ بالله من الشیطان والسیاسة )م هەلگرت ، هەموو کاتم بۆ لێکدانەوەی ماناکانی قورئانی پیرۆز تەرخان کرد .. ئیتر لە جیهانی سەعیدی نوێدا دەژیام ، قەدەر بردمی بۆ نەفی کردن لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر . تا لەم کاتانەوە لە ناخی دڵمەوە مانای جوانو بەرز کە لە فەیضی قورئانی پیرۆزەوە هەڵدەقوڵا ، لە دایك دەبوو ، ئەو کەسانەی لە چوار دەورم بوون دەیان نوسییەوە ، ئەمانەش بریتین لەو پەیامانەی کە ناوم نان (پەیامەکانی نور) . بەڕاستی ئەمانە لە نوری قورئانی پیرۆزەوە هەڵقوڵاون . ناوەکەیشی لە ناخی ویژدانمەوە هاتۆتە دەرێو خۆیشم لەو باوەڕەدامو بە یەقینێکی تەواوەوە کە ئەم پەیامانە لە زادەی مێشکی خۆمەوە نین بەڵکو ئیلهامی خواییەو لە نوری قورئانەوە بەسەر دڵمیدا ڕژاندووە ، لەو یەقینەدام هیچ ڕێگایەك نیە بۆ پارێزگاری باوەڕی خەڵکی جگە لەم ڕێگایە نەبێت .. هەروا بەردەوام دەبێتو دەڵێت : لەم پەیامانە نزیکەی ۱۳۰ پەیامن هیچ باسێکی دەربارەی کاروباری دنیاو سیاسەت تێدا نیە ئیمانو ئاخیرەت نەبێ ) . بەردەوام دەبێت : کە چۆن هەڵپەرستانو پیاو خراپان ویستویانە تۆمەتی بۆ پەیدا بکەنو بە هۆیەوە چەندین جار گیراوەو نەفی کراوە ، ئەمجا دەڵێ : هەر دادگایەك لێ وردبوونەوەی عیلمیانەی کردبێت بڕیاری بەرائەتی ئێمەی دەرکردووە .. حقائق الایمان ترجمة احسان قاسم الصالحي . مامۆستا نورسی زۆر بە جوانی مەبەستو ئامانجی بزوتنەوەکەی بۆ ژیانی دەرخستووە تا بزانن خەریکی چیەو لێی نەکەونە گومانەوەو ئەمجا نەیەڵن تەنها هەنگاوێك بنێت . یان هومەر تەلمسانی چۆن ئامانجو مەبەستی بزوتنەوەکەی خۆیان لە میسرا ئاشکرا کردووەو بۆ هەموولایەك دەری خستووە کە کاری ئەوان چاك کردنی خەڵکیو ڕێکوپێك کردنی حوکمە لە ڕێگەی

بەهەرحاڵ سوڵتان ئەو بڕیارەی بەندکردنی ئیمامی ڕاستەوخۆ بەهۆی بزوتنەوەکەیەوە دەرنەکرد بەڵکو جارێکیان داوای ئیمامی سەرهەندی دەکات تابێت لە بارەگاکەیدا ئامادە بێت ، ئەم داوایەی لە حاکمی سەرهەند دووبارە کردەوە ، کە هەرجۆنێك بووە ئیمامی بۆ بنێرێت ، ئیمامیش بە خۆیو پێنج کەس لە هاوڕێو مریدەکانی کەوتە ڕێ بەرەو بارەگای سوڵتان ، کە سوڵتان بە هاتنی ئیمامی زانی هەندێ لە گەورە پیاوانی خۆی ناردە پێشوازی کردنیو ، لە نزیك کۆشکی جیهانگیرەوە خێوەتیان بۆ هەڵدا ئەمجا جیهانگیر داوای دیتنی ئیمامی کرد لە کۆشکەکەیدا ، کاتێ ئیمام چووە لای پەیڕەوی دابو نەریتی چوونە لای سوڵتانی نەکرد ، سوڵتانیش هۆیەکەی لێ پرسی ئەمیش لە وەڵامدا وتی : مــن تا ئێستا پەیڕەوی ئەو دابو یاسایانە دەکەم کە خواو پێغەمبەری خوا هێناویانە ، جگە لەم دابانە هیچی تر نازانم ئەم وەڵامە سوڵتانی زۆر توڕە کردو وتی سوژدەم بۆ بە ، ئیمام فەرمووی جگە لە خوا سوژدەم بۆ کەسی تر نەبردووەو هەرگیز نایبەم ، ئیتر ئەمە زیاتر ڕقی سوڵتانی هەڵساندو فەرمانی بەندکردنی ئیمامی سەرهەندی دەرکرد ، لــە قەڵای کوالیاردا .

---

-

هەولدانێکی هێندیو ئاشتیانەوە وەك کۆدیتاو شۆڕشەو ئاگرنانەوە .. ئەوەتا لە چەندین گۆڤارو ڕۆژنامەدا ئەمەی ئاشکرا کردووە وەك گۆڤاری ( اليوم السابــع ) العدد ١٠٩ الاثنين ٩ حزيران ١٩٨٦ کە چاو پێکەوتنێکەو ئاشکرای دەکات بە ناونیشانی ( نريد اصلاح الحكم لا تغيير الحاكم ) .. لێرەدا دەبێ ئاگامان لەوە بێت کە باری ژیانی عێراق بە گشتیو کوردستان بە تایبەتی جیاوازییەکی زۆری هەیە لەگەڵ ژیانی تورکیاو میسر ، بەڵام ئەم ڕوونکردنەوەیە بۆ سود وەرگرتنە لەوان ، نەك دەقــاو دەق وەکو ئەوان ..

# زیندووکردنەوەی ڕێبازی حەزرەتی یوسف لە بەندیخانەی کوالیاردا :

ئەم بەند کردنەی ئیمام لـــە قەڵای کوالیاردا ، زۆر حیکمەتو بەرژەوەندی تێدا بوو ، چونکە هۆیەك بوو کـە ئیمام زیاتر خۆشەویست بـکاتو خەڵکی زیاتر بە دەمیەوە بچن ، خاوێنی نەفسو بەرزی ڕۆحیو ، ورشەی دەروونی لە ئیمامدا پەرەی سەند ، ئەم بەندکراوە هەر وەکو یوسفی بەندکراو لە میسردا چاکی چالاکی لێکرد بەلاداو ، دەستی کرد بـــە تێکۆشانو بانـگەوازیو ڕابەری کردنی ئەو بەندکراوانەی لەگـــەڵیدا بوون ، لە ناو چوار دیواری بەندیخانەدا بە هەموو ئەو دەنگە زوڵاڵەی خۆی چریـکاندیو فەرمووی :

« یا صاحبي السجن أأرباب متفرقون خير ام الله الواحد القهار ...

( ئەی جووتە هاوڕێی بەندم ، ئایا چەند خوایەکی جیا جیا چاکترە یان خوای تاكو تەنیای بەزەبر ) . ئەم دەنـگە نەمرە بەهێزە پایەکـــانی قەڵاکەی هێنـــایە لەرەو ، دیوارەکانی بەندیخانەکەی لەرزاندەوەو ، سەداکەی لە دەرەوەی بەندیخانەش دەنـگی دایەوە .. بە هـــەزاران بەندکراوی ناموسـڵمان ، موسـڵمان بوونو بەهۆی ڕەفتارو ئاکـــارو

ڕابەریی ئیمام ، وایان لێ هات کە ئاینی ئیسلام بکەنە ئاینی خۆیان ، سەدان موسڵمان سەر لەنوێ تۆبەیان نوێ کردەوەو بەیعەتیان لەگەڵدا بەست ، جێژو لەزەتێکی زۆریان لە هاوڕێیەتی ئیمامدا دەبینی ..
دکتۆر (ئارنلد) لە کتێبەکەیدا ( الدعوة الى الاسلام )
دا دەڵێ :ـ

( لە سەردەمی سوڵتان جیهانگیردا « ١٦٠٥ ـ ١٦٢٨ی ز» زانایەکی سوننی هەبوو بە ناوی شێخ ( احمد المجدّد ) ، لەو سەردەمەدا بەوە ناوی دەرکردبوو کە بەربەرچی عەقیدەی شیعەی دەدایەوە ، شیعەکانیش لە کۆشکی سوڵتاندا خاوەن دەسەڵات بوون ، پیلانیان بۆ گێڕا تا بەگرتێن داو هەروا مایەوە تا دوو ساڵ ، لەم ماوەیەدا دڵی سەدان لە بەندکراوە غەیرە موسڵمانەکانی بەرەو ئیسلام ڕاکێشاو ، کردنی بە موسڵمان ) .

لە ( دائرة معارف الاخلاق والديانات )دا هاتووە دەڵێ : « لە بابەت زانایەك لە زانا موسڵمانەکان دەگێڕنەوە ناوی شێخ ( احمد المجدّد ) بووە ، لە سەدەی هەڤدەیەمی زاینیدا لە هیندستان ژیاوە ، بە ستەم بەندیان کردووە ، بەڵام بە سەدان لە غەیرە موسڵمانی بەندکراوی لای خۆی هێناوەتە ناو ئاینی ئیسلامەوە » .

بەڵێ خوای گەورە نیعمەتێکی زۆری بەسەر ئیمامدا باراند ، چونکە سودە ڕۆحیو دەروونیەکەی لەو قەلایەدا وەری گرتووە لەوانەیە لە کاتی ئیسراحەتدا ئەوەی بۆ بەدەست نەهاتایە ، .. بەڵێ ئەوەی لە ناخیەوە ئارەزووی بوو پێی بگات ، پێی گەیشت ، چونکە داواکردن لە ناخەوە جۆرێکە لە دوعا کردن .. مەبەستمان لەوەیە خۆ ئیمام دوعای ئەوەی نەکردووە تووشی گرتن‌و بەڵاو ناخۆشی

بێت ، بەڵکو داوای ئەوەی کردووە کە دەروونو ڕۆحی زیاتر بەرەو ئاسۆی بەندایەتی بۆ پەروەردگار بەرزبێتەوە .. جا خوای گەورەش خۆی دەزانێ ئەو داوایەی جێ بەجێ بکاتو ئەو دەردەی تیمار بکاتو حیکمەتی خۆی تێدا بەکار دەهێنێت بۆ نمونە کاتێ کە نەخۆشێك پەنا دەباتە بەر پزیشکێك بۆ چارەکردنی جا یان پێویست بە دەرمان ناکا لەبەر سوودی نەخۆشەکە یان دەرمانێکی دەداتێ کە خۆی بەچاکی دەزانێت نەك ئەو دەرمانەی کە نەخۆشەکە داوای کردووە ، یان ئەوەتا دەرمانەکەی دەداتێ بەڵام تامەکەی زۆرتاڵە کەچی هەر دەبێت بیخواتەوە تاوەکو چاك بێتەوە ...

بەڵێ حیکمەتی خوای گەورە لەوەدا بوو کە ئیمام توشی ئەو بەڵایە بێت بۆ ئەوەی بەو ئاواتەی بگاتو ئەو دەردەی چارەسەر بکرێت ، هەروەکو ئیمام خۆی باسی کردووە کە چەندە سودی لەو بەندکردنەی وەرگرتووە وەکو بەرزبوونەوەی دەروونی بەرەو ئاسۆی بەندایەتیو ، پێ دەنگ کردنی ئارەزووی نەفس ، ئەمانەی لە هەندێك لە نامەکانیدا باس کردووە ، یەکێ لەو نامانەی ناردوویەتی بۆ شێخ ( میر محمد نعمان ) دەڵێ :

« سوپاس بۆ ئەو خوایەی لەش ساغی لە ناو بەڵاو ناخۆشیدا پێ بەخشیوم ، لە ناو زوڵمو جەفادا دڵ نەوایی کردووم ، لە ناو ئازارو ئەشکەنجەدا لوتفی لەگەڵدا نواندووم » .

وا دەردەکەوێت ، لەو کاتەی کە هەواڵی گرتنی ئیمام بڵاو بۆوەو دەنگی دایەوە ، خەڵکی کەوتونەتە تانەو تەشەرە لێدانو ، لە باسکردنیدا زیادە ڕەوییان کردووە ، دۆستانو خۆشەویستو مریدەکانی ئیمام زۆر خەمبار بوون لەم بارە ناڵەبارو ، پڕوپاگەندانە ،

بۆیە ئیمام لەو نامانەی بۆی دەناردن داوای ئارام گرتن و خۆگرتنی لێ دەکردن • ئەوەتا لە یەکێك لە نامەکانی دا کە بۆ دڵسۆزێکی خۆی ناردووە کە شێخ ( بدیع الدین )ە دەڵێ : « ئەم هەزارە کاتێ گەیشتە قەڵای گوالیار هەر لە ڕۆژانی یەکەمەوە هەستم کرد ، نوری ئەو لۆمانەی خەڵکی و ، ڕەخنەو جنێودانەکانیان ، بە چەشنی پەڵە هەورێکی نورانی لە شارو گوندەکانەوە بە پەردەوامی بۆم دەهاتن لە لاوازی و کۆڵەواریەوە بەرەو عیزەت و سەربەرزی دەیان بردم ماوەی چەندین ساڵم لە ناو پەردەیەکی پڕ لە لوتف و جەماڵەوە بڕی وا ئێستا کاتی ئەوەیە لە ڕێگای پەروەردەیەکی پڕ توندو تیژی و جەلالەوە بمبەن ، کەواتە پێویستە لە مەقامی صەبردا خواڕاگرتن و لە مەقامی شوکریشدا ئارام‌گرتن ، چونکە جەلال و جەمال دوو سیفەتی پێکەوەن لە یەك جیا نابنەوە • •

هەروەها ئەم بەندکردنەی ئیمام بەبێ ڕەوا زۆر لە میرانی کۆشك و پیاوانی دەوڵەتی سونی مەزهەبی پەست کرد ، ئەوانیش وەکو ( الرحیم خان خانان )و (خان اعظم)و (السید صدرجهان)و (خان جهان)و زۆر کەسی‌تر بەم کارەساتە دڵ غەمبار بوون •

بە هەر حاڵ سوڵتان بە هەر هۆیەکەوە بێت[1] لەم کارەی کردی پەشیمان بۆوە ، یان ئەم کارەی بەجۆرە تەئدیب کردنێك داناوە ، لەبەر ئەوە پێی خۆش بوو ئیمام بێتە کۆشکەوەو چاوی پێ‌بکەوێت •• ساڵی (١٠٢٩ك ـ ١٦٢٠ز) لە بەندیخانە بەر بووە •

---

(١) وەکو دەڵێن جیهانگیر لە خەویدا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ی دیوە پەنجەکانی دەگەزی و ئاخی هەڵدەکێشاو دەیووت ئەی جیهانگیر ئەم مرۆڤە مەزنەت ، بەند کردووە !؟

## ئیمامی سەرهەندی لە ناو ئۆردوگای سوڵتاندا :

ئیمام لە قەڵای کوالیارەو بەسەر بەرزیو پێزو شکۆداریەوە هاتە دەرێ ، بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لە سەرهەندا مایەوە ، پاشان گەڕایەو بۆ ئۆردوگای سوڵتان جیهانگیر ، ( خرم شاهجان )ی کوڕی جیهانگیرو ، سەرەك وەزیران پێشوازیان لێ کرد ، جیهانگیر داوای ئەوەی لێ کرد بۆ چەند ڕۆژێك لە ئۆردوگاکەیدا بمێنێتەوە ، ئەمیش ئەو داوایەی قەبوڵ کرد ، هەر ئەمانەیش بوو کاری کردە سەر سوڵتانو ئەوانەی ناو ئۆردوگاکەش ، بۆیە کەڵکێکی زۆری گەیاند .

ئیمامی سەرهەندی لەو نامانەی بۆ کوڕەکانی نوسیوە باسی ئەو سودگەیاندنو بەرهەمانەی کردووە کە دەستی کەوتووە دەڵێ

« من وا دەزانم مانەوەم لە ئۆردوگادا لەگەڵ بێ ئارەزوویی‌و ناحەزی خۆیشم‌وبە هەڵێکی چاکی دەزانم ، یەك سەعات مانەوەم لەگەڵیاندا بە چاکتری دەزانم لە چەندین سەعات مانەوەم لە شوێنانی تردا » .

لە نامەیەکی تردا دەڵێ : « ئەو بارو زروفەی منی تێدام پێویستی بە ستایشی خوایە ، چونکە چەندین سەعات بە خۆشی‌و قسەی بەسود بەسەر دەبەین ، بە یارمەتی خوای گەورەش ، ئەمەڵی‌و مەرایی کردن خۆی

:كوتيته ناو كۆڕو گفتوگۆكانمەوە ، دەربارەی كاروباری ئايين‌و پايەكانی ئیسلام ... بەیارمەتی خوا لەم كۆڕانەدا بە چەشنێك لە گەڵیان دەدوێم ، كە لە خەڵوەتە تايبەتيەكانمدا قسەی تێدا دەكەم » .

لە نامەیەكدا بۆ شێخ ( خواجه حسام الدين )ی نوسيوە تيايدا دەڵێ :

« ئەو براو هاوڕێ خۆشەويستانەی لەگەڵمدان هەموويان دڵخۆش‌و ئاسودەن ، بەردەوام حاڵيان لە پێش كەوتن‌و سەركەوتندايە ، هەر دەڵێی ئەم ئۆردوگايە بە هۆی ئەمانەوە بووە بە تەكيە » .

ئيمام لە ناو ئۆردوگای جيهانگيردا بوو ، هاوڕێيەتيەكی بەتين پەيدا بوو لە نێوان ئيمام‌و جيهانگيردا ، ئيمام لەم ئۆردوگايەدا بوو كە گەيشتە لاهور ، لەوێوە چوو بۆ سەرهەند ، ئيمام حەزی دەكرد لە سەرهەندا بمێنێتەوە ، بەڵام سوڵتان نەيدەتوانی لێی جيابێتەوە بۆيە ڕێگەی نەدا ، ئەميش لە گەڵيدا چوو بۆ دەهلی‌و لەوێوە بۆ بارس‌و پاشان چوونە ئەجمير . ئيتر لەوێدا ماوەيەك مانەوە .

ئەم هاوڕێيەتيەی ئيمام جيهانگير زۆر سوودی گەياندووە ، هەر ئەم هۆيەش بوو بووە هۆی زيندووبونەوەی نەزعەی نوێ كردنەوەی ئايين‌و گرنگی دان بە مزگەوتە وێران كراوەكان‌و دامەزراندنی قوتابخانە ئاينەكان ، پەيدابوونی ئەو سۆزو هەستە ئيسلامی‌يەو ئاشكراكردنی دروشمەكانی ، ئيشكيكە لەو هاوڕێيەتيەی لەگەڵ ئيمامدا بەمەست بووی .

## خۆ ئامادەکردنی بەرەو مردن :

شێخ ( خواجە محمد الکشمی ) دەڵێ : ساڵی ١٠٣٢ك ئیمامی سەرهەندی لە ( ئەجمیر )دا جێگیر دەبێ ، جا ڕۆژێکیان وتبووی : ئەوا ڕۆژی سەفەر کردنم بەرەو ئاخیرەت نزیك بۆتەوە ، ئەمجا نامەیەك بۆ کوڕەکانی دەنوسێ کە لە سەرهەندا دانیشتبون تیایدا وتبووی ( تەمەنم نزیکی تاوابونێتیو ، منداڵەکانیشم لێ دوورن ) • هەر ئەوەندە نامەکە دەگاتە دەستی کوڕەکانی ، هەموویان دەست بەجێ لە (ئەجمیر)دا ئامادە دەبن •

کاتێ ئیمام گەڕایەوە بۆ سەرهەند نزیکەی دە مانگ لەوێدا دەمێنێتەوە ، بەڵام لەم گەڕانەوەیدا بۆ سەرهەند ، وازی لە هەموو پەیوەندیەکی هێناو لە خەڵکی دابڕاو ، گۆشە گیریو تەنیایی بۆ خۆی هەڵبژارد ، جگە لە کوڕەکانی نەیدەهێشت کەسی تر بچێتە لای ، جگە لە دوو هاوڕێ تایبەتیەکەی هەمیشە سەریان دەدا ، هەروەها بۆ پێنج فەرزەی نوێژو نوێژی جومعەش دەهاتە دەرێ ، ئیتر زۆربەی کاتەکانی بە زیکرو تۆبە کردنو خۆ خەریك کردنی بە دەروونیەوە بەسەر دەبردە توشی تەنگە نەفەسی بوو بوو ، هەر کاتێ ئەو نەخۆشیەی زۆری بۆ

بهێنابایه گریان دەیگرت‌و دەیفەرموو (اللهم الرفيق الاعلى) دەپاڕایەوەو دەیگوت خوایە بەرەو لای خۆتم بەرەو تینوم بە دیدارت ، دەمێکە چاوەڕوانی ئەو ڕۆژەم بە تینێکی نورت شاد بم‌و ، ئەو فرمێسکانەی لە پێناوی تۆدا ڕشتومە هەر دڵۆپێکی لە ناو صەدەفی بەندایەتیدا بێت بە مرواریەك‌و نرخی منی ، لەبارەگای پیرۆزی تۆدا ، پێ بەرز بێتەوە ..

کوڕەکانی لەم کاتی ناڕەحەتیەیدا ڕۆژێکیان بینیان زۆر دەگری زۆریش دڵی ناسك بووە ، ئەمانیش لێی دەپرسن ، ئەوە چیتە بۆ وا دەکەیت ؟ لە وەڵامدا فەرمووی ( شەوقی گەیشتنمە بە خودا ) .. ئەمجا کوڕەکانی لێیان پرسی بۆچی لە تێمە دوور کەوتویتەوە ؟ خۆ ئەمە خووی تۆ نیە ، فەرمووی ( خوای گەورەم لە ئێوە خۆشتر دەوێ ) .

شەوێك لەو شەوانەی شەو نوێژی دەکرد پێی وتن ( ئەمە دوامین شەو نوێژی منە دەیکەم ) .. هەر وەکو خۆی فەرمووی وا دەرچوو .

لە کاتێکدا لە ئازاری سەرەمەرگدا بوو و ، ئەجەل بە تەواوەتی لێی نزیك ببۆوە ، ئامۆژگاری چوار دەورەکەی دەکردن تا شوێنی سوننەت بکەونو لە بیدعەت دوور بکەونەوە[1] ..

---

(١) لێرەدا دەبێ ئاگامان لە بیدعە بێت ، بیدعەی چاك‌و بیدعەی خراپ لە یەکتر جیا بکەینەوە . مامۆستا مەلا کەریمی مدرس لەیەکێ لە فەتواکانیدا لە گۆڤاری ( التربية الاسلامية )دا دەڵێ : لەفزی بیدعە بە پێی زمانی عەرەبی‌و لەوەی لە قورئانی پیرۆزدا هاتوتە خوارەوە ، بریتیە لە هەموو داهێنانێك کە لەوەو پێش نەبووبێ ، وەکو فەرمودەی خوای گەورە :ـ بديع السموات والارض ـ یانی دروستی کردوون بێ لەوەی هیچ نمونەیەکیان لەوەو پێش هەبووبێ ، جا بیدعە بەم چەمکە گشتیە ، هەموو

شەوی سێ شەممە ٢٩ی سەفەر بۆ بەیانیەکەی ئەو ڕۆژەیە تیایدا کۆچ دەکاتو بەرەو خانەی ئارامگا دەڕواتو بەتەواوەتی ژینی دونیــا بەجێ دەهێڵێت ، دەچێتەوە بۆ لای ئەو زاتە پاکەی دەمێك بوو بە ئاواتەوە بوو بە دیداری شاد بێت .. بەڵێ بۆ سبەینێ گیانی پڕ لە ئارامی فڕیو

---

ئەوانە دەگرێتەوە کە لەگەڵ ئایین بگونجێ یان پێچەوانەی ئایین بێت .

بە پێی عورفی شەرع ئەوەی دادەهێنرێت پێچەوانەی بەڵــگەی تایبەتیو گشتی فەرمانی شــەرع بێت بەم مانایە گومراییەکی تەواوەو هیچ خێرێــکی تیدا نیە چونکە حەقو ڕاستی ئەوەیە کــە لەگەڵ شەرعدا بگونجێ ، بەڵام ئەمە پێچەوانەیەتی ، جــا ئــەو بیدعەیەی کە لە وتەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دا هــاتووە کە لە ( ابي نجيح عرباض کوڕی ساریە ) ڕیوایەت کراوە ئەمەیە ( واياكم ومحدثات الأمور فان كل بدعة ضلالة ) ئەمــە ئەو بیدعەیە یە کە بە پێی مانا شەرعیەکەی باسمان کرد . بیدعەی شــەرعی تایبەتە ، بەڵام بیدعەی (لغوي) گشتیە . هــەموو بیدعەیەکی شــەرعی بیدعەی ( لغوية ) ، بەڵام هەموو بیدعەیەکی (لغوي) بیدعەی شەرعی نیە چونکە تەنها بیدعەی شــەرعی گومراییەو بەس ، بەڵام بیدعەی (لغوي) لەوانەیە لەو پێویستیانە بێت کە شەرع داوای دەکاتو لەوانەشە لە دەرەوەی شەرع بێت. کەواتە بیدعەی لغوي ئەوەیە کە کوڕی بڵاو کردنەوەی ئیسلامی لە سەر وەستا بێت وەکو کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز لــە سەردەمی ئەبوبەکری صدیق ( خــوای لێ ڕازی بێت ) دا بۆ پاراستنی ئەسڵی ئایەتە پیرۆزەکــانی ، تا نەفەوتێن وە کۆکردنەوەی لە سەردەمی عوسماندا لەسەر لەهجەی قورەیش تا وەکو ئەوەی لیسلامی دووبەرەکی نەکەوێتە نێوانیانەوەو لیسلام بەسالمی بمێنێتەوە ، هەروەها نوسینەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە سەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیزدا ... هتد . التربية الاسلامية ـ العدد الثاني عشر ـ السنة السابعــة والعشرون ١٩٨٦ آب ١٤٠٦ ذو الحجة .

قەفەسی جەستەیی بەجێ هێشت‌و ، لە لای پەروەردگاری خۆشەویستی ئارامی گرت ، هەروەکو زبانی حالی ئەم چەند وتەیەی وتبێت :

**ئەی عەشقەکە دەڵێن گڵپەی دەڵێن‌گری**
**کوا گڵپەکەت کوا گڕەکەت**
**بم سووتێنن ڕزگارم کەن**
**لە ناو قەفەسی ئەم لەشەم**
**وەکو باڵندەیەك بفڕێن**
**لەوانڕی .. ئەوانڕی**
**وەکو خوای گەورە دەفەرموێ :**

( یا ایتها النفس المطمئنة ارجعی الی ربك راضیة مرضیة ) لە تەمەنی شەست‌و سێ ساڵیدا کۆچی دوایی دەکات .

لە کاتی شۆردنیا دیقەتیان دا بەدەستی ڕاستی مەچەکی دەستی چەپی گرتووە ، هەروەك بڵێی بۆ نوێژ کردن وەستا بێت ، هەر چەندە دەستیان لە یەك جوێ دەکردەوە وەکو خۆی لێ دەهاتەوە ، هەر بەم جەشنە هێشتیانەوە ، لە پاش مردنیش زەردەخەنەی سەر لێوە ئاڵەکانی هەر ئاوا نەبوو بوون . خۆی تەرخان کرد بوو بۆ چاندنی خۆشەویستی لە دڵی خەڵکیدا ، دەبێ خۆی چۆن ڕوخۆش‌و دەم بە زەردەخەنەوە نەبێت . هەر وەکو شاعیر دەڵێت

**ئەی ئادەمیزاد بیرتە کە لە دایك بوویت**
**خەڵکی پێدەکەنین‌و تۆ دەگریایت**
**دە وا بژی کــــە تۆ مردیت**
**ئەوان بگرین تۆ لە پێکەنیندا بیت**

## خوو و ڕەوشتی

شێخ ( محمد الکشمي ) نزیکەی سێ ساڵ لەگەڵ ئیمامدا ژیاوەو دەربارەی ، دەڵێ :

چەند جارێك گوێم لێ بووە ئیمام فەرموویەتی :ـ « نرخـی تێکۆشانو کاری ئێمە دەبێ چیبێ ، هەمووی هەر لە فەزڵی خواوەیە، تەنها ئەوەی متمانەی دەخەینە سەر ، بریتیە لـە گوێڕایەڵیو شوێن کەوتنی پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم چونکە پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم ئەو جەمسەرەیە کـە هەموو کردارێك بە دەوریدا دەسوڕێتەوە ، هـەرچی خودا دەیبەخشێ بەبەندەکانی لە ڕێـگەی شوێن کـەوتنو دەست گرتنە بە ڕێبازەکەیەوە ، هەرچی شتێکیش لێی بێ بەش بووین، بە کـەمو زۆرەوە هەموو هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەم کەمو کوڕیو بێ گوێ‌یەی لە ئاستی ڕێبازەکەی ئەودا دەینوێنین » « ڕۆژێـکی تر گێڕایەوەو وتی : « ڕۆژێك چوومـە سەر ئاودەستو لێم تێك چوو قاچی ڕاستم پێش خست لـەو ڕۆژەدا لە زۆر ئەحواڵو مەقامات بێ بەش بووم » .. جارێکیان بە ( صالح الختلانی ) وت بڕۆ لە کیـسەکەمـدا چەند دەنـکە مێخەکێکم بۆ بێنە ، ئەویش چوو شەش دەنـکە مێخەکی بۆ هێنا .. ئیمام زۆری پێ ناخۆش دەبێت ، ئەمجا دەڵێ : ئـەم سۆفیـە نازانێ کە پێغەمبەر ـ صلى الله علیه وسلم دەفەرموێ : ( انّ الله تعـالى وتر یحب الوتر )[1] .. چونـکە زۆر حەزی لە پەیڕەوی کردنی وەتر دەکرد ، بەم شێوەیە سۆفیەکانی فێری پەیڕەوی کردنی سونەت دەکردە شێخ ( محمد بن فضل الله ) دەڵێ : زۆر بە توندی دەستی بە سونەتەوە

---

(۱) خوای گەورە تاکەو تاکیشی خۆش دەوێ .

کرتبوو ، گزنگی‌یەکی زۆری پێ دەدا ، هیچ جۆرە سوننەتێکی گەورەو بچوکی واز لێ نەهێناوە ، بەڕاستی ئەمەش بە هەموو کەسێ ناکرێت(١) .

ئیمام هەموو جارێك دەیفەرموو :

( ئەم دنیایە خانەی ئیش کردنەو ، کێڵگەی ئاخیرەتە ، پێویستە ئامادەیی دڵو زیکرکردن ، لەگەڵ کردەوە ئاشکراکانو ئادابی شەرعی کۆبکرێنەوە ، پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم وەختی خۆی لە کاتی نوێژکردندا هەر دوو پێیەکانی دەئاوسان ئەمەندە بە پێوە دەوەستا ، کەچی خۆشەویستی خوایەو ، گەورەترین پێغەمبەرو نێرراویەتی ) .

ئیمام لەگەڵ ئەوەشدا کە شارەزای متونو مەسەلە فیقهی‌یەکان بوو ، خاوەنی هێزێکی ڕۆچوو بوو لە ئوصوڵی فیقهدا ، سەرەڕای ئەمانە هەر لەبەر ئیحتیاطو وەرەعی لە ئاییندا ، هەمیشە بەو کتێبانەدا دەچووەوە کە بڕوا پێکراون ـ لەکاتی فەتوادانیدا ـ لەگەڵ خۆیدا بۆ هەموو شوێنێکی دەبردن ، بەپێی ئەو فەتوایانە دەجوڵایەوە کە گەورە پیاوانی فیقه ڕایان لەسەر بووەو بە باشیان زانیوە .

زۆربەی کات لە نیوەی دووەمی شەودا یان هەندێ جار لە بەشی سێ‌یەمی کۆتایی شەودا هەڵدەسایەوە بۆ شەونوێژ ، ئەم نەریتەی خۆی لە زستانو هاوینو سەفەرو مانەوە تێك نەدەدا ، بۆ خۆی دەست نوێژی

---

(١) ئەمەش حیکمەتێکی گەورەی خودایە کە مجددێك لەو سەردەمەی بیدعەت تەشەنەی کردووەو دووری لە ئیسلام بڵاو بۆتەوە ئیمام دەست بگرێت بە سوننەتەوە بەم جەشنە توندو تیژیە .

دەگرتەو نەیدەهێشت کەس ئەو بکات بە دەستیدا ، هەمیشە سیواکی بەکــار هێنــاوە •

زۆر جار دەیوت • وەکو بۆم دەرکەوتووە کە سەرتاپای جیهـان بە جارێ لە ناو بیدعەتو خورافاتا نوقم بووە ، بەڵام نوری سونەت لـە نێوەندی ئەم تاریکیەدا هەر وەکو ( گۆ ئەستێرە ) لە شەوی تاریـکدا ، دەدرەوشێتەوە ، زۆری ڕق لــە غەیبەتو دەرخستنی عـەیبو کـەمو کوڕی موسـڵمانان بووە ، فوتابیو مریدەکانی نەیاندەتوانی لەبەر هەیبەتو سامو بیمیدا لەبەر دەمیـدا غەیبـەتی کەس بکەن هەموو ڕۆژێ پاش نوێژی نیوەڕۆ لە لای یەکێك لەوانەی قورئانیان لەبەر بوو ، گوێی لە جوزئێکی قورئان دەگرت ئەگەر دەرسی بوایە ئەوا دەرسی دەوتەوە وەکو تەفسیری ( بیضاوی )و (صحیح البخــاری)و (مشکاة المصابیح) هەروەها دەرسی ( علم الفقـه )و ( اصـول الفقـه )و ( علم الـکلام )و ( هدایة الفقه )ی مورغینانیو ( اصول البردوی )و ( المواقف )ی بــە قوتابیەکانی دەگوت ، لــە تەصەووفیشدا کتێبی ( عوارف المعارف )ی دەوتــەوە •

نوێژی ( الأوابین ) لە دوای نوێژی ئێوارانە دەیکرد ، لە دەڕۆژی کۆتایی ڕەمەزانی هەموو ساڵێك دەچووە ئیعتیکافەوە •• قورئانی پیرۆزی هەموو لەبەر بوو ، لە ڕەمەزانو غەیری ڕامەزانیش لەبەر دەیوتەوە تەواضعی لــەڕادە بەدەر بوو ، زۆر نەرمو نیــانو ڕووخۆش بوو ، هاوڕێیەتی زۆر خۆش بوو • هەمیشە نزیـکەی پەنجا تا شەست کەس لە زاناو پیاو چاکانو گەورە پیاوانو قوتابیانی لە لا دەمانەوە ، خواردنی ئەمانە هەموو لە میوانخانەکەی ئیمام دەدرا •

## منداڵەکانی :

خـوای گـەورە حـەوت کوڕی بە ئیمام بەخشیوە ، بوایان هەر بە منداڵی دەمرن ، ئەوانیش شێخ ( محمد فرخ )و شـێخ ( محمد عیسی ) بوون ، شێخ ( احمد شرف ) هەر لە تەمـەنی شیرە خۆریدا مردووە • کوڕە گەورەکەی ( محمد صادق ) پاش تەواوکردنی خوێندنو سلوك لە تەمەنی بیستو پێنج ساڵیدا کۆچی دوایی دەکات •

ئەوانەی مانەوە سێ کوڕەکەی تر بوون ئەوانیش ( شێخ محمـد سعید ، محمد معصوم ، محمد یحیی )بوون ، ئەم خێزانە مەزنە زنجیرەی زێڕینو خۆری پرشنگدار بوون •

شێخ عبدالباقي زۆری وەسفو مەدحی کـردونو نـاوی نـاون ( الجواهر العلوية )و ( الشجرة الطيبة ) دووبارە دەربارەیان فەرمویەتی: ئەمانە هەزاری بەو بارەگای خوداانو لە سنگیاندا دڵی سەرسوڕهێـەری تێـــدایە •

کوڕی یەکەمی شێخ ( محمد صادق ) گەیشتە پلەی کەمـالو ، ئەوبەری پلەی ئیحسان •• کوڕی دووەمی شـێخ ( محمـد سعید ) بەشداریەکی زۆری کردووە لە بڵاوکردنەوەی تەریقەتی ئیمـامو فێرکردنی داخوازانو ڕابەری کردنی ڕێگرانی تەریقـەت ، بـەرەو شەریعـەت •

کوڕی سێیەمی ( شێخ محمد معصوم ) هەڵگری زانیاریەکـانی بلوکی بوومو ڕافەکەری زانیاریو ڕاستیەکانی بووە هەروەهـا خەلیفەو هەڵـگری نهێنیەکانی بووە ، لەسەر دەستی ئـەو تەریقـەتی

موجەدیدی بە تەواوەتی بڵاو بۆوە ، بەهۆی ئەم تەریقەتەوە سەر لەنوێ بازاڕی ئیسلامو سوننەتی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم پەیدا بووەوەو ، کەڵكو سودی بە هەموو لایەك گەیاند ، وەکو دەڵێن ( شێخ معصوم ) چرای هەموو ناوچەی وڵاتێکە بەهۆی ئەوەوە بوو زەوی هیندوستانو ڕۆما ڕۆشن بووەوە •

نامەکانی شێخ محمد معصوم ڕاڤەو درێژە پێدانێکی نامەکانی ئیمامەو لەسێ بەرگدا کۆکراوەتەوە ••• کوڕی چوارەمی شێخ ( محمد یحیی ) تەمەنی نۆ ساڵان بوو کە باوکی وەفاتی کرد ، لەبەر ئەوەیە زانیاریەکانی لە براکانی وەرگرتووەو ، لەسەر دەستی ئەواندا پەروەردە بووەو ، پێگەیشتووەو ، تەریقەتی لەوانەوە وەرگرتووە •

# خالی نوێ کردنەوەو چاکە کارییەکانی ئیمامی سەرهەندی :

هەموو زاناو پسپۆڕان مێژوونوسە دەست پاکەکانو ئەوانەیشی کە شارەزاییەکی تەواویان هەیە دەربارەی ئیسلام بەگشتیو مێژووی ئیسلامی هیندستان بەتایبەتی ، تیکڕا هەموو یەك دەنگن لەسەر ئەوەی کە ئیمام ڕۆڵێکی مەزنی دیوە لە سەرخستنو پتەوکردنو بەرگری کردن لە ئاینی ئیسلامی پیرۆز ، تاقە کەسێك بووە لە هیندستاندا کە مێژوویەکی نوێی هێناوەتە کایەوەو سەردەمێکی نوێ دەستی پێکردووە ، لە زاراوەی ئیسلامیدا ئەم کارە بە (تجدید) نوێکاری[1] ناسراوە ، ئیمامی سەرهەندیش هەر بەو ناوەوە ناسراوە تاوەکو نازناوی (مجدّد ـ نوێخواز ) بەسەریدا زاڵبووە ، هەمیشە هەر بەو ناوەوە ناوی هێنراوە لە جیاتی ناوی خۆی ...

نوێکاریو چاکەکارییەکەی ئیمام لەوەدا بوو فیکری ئیسلامی

---

(1) پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ : « ان الله عزوجل یبعث لهذه الأمة علي راس کل مائة سنة من یجدد لها دینها » . سنن ابي داود .

خاوێن کردەوە ، زیندووی کردەوەو گیانی بەبەردا کردەوە • تەلیسمی ئەو هەوڵە کومڕاکەرانەی لەسەر بناغـــەی موجاهەدات‌و ، وەرزشی ئیشراقیەکان بۆ پاك کردنەوەی دەروون‌و ناسینی خوداو ، گـەیشتن پێی هەڵوەشاندەوە کە ، لەسەر چەند بناغەو ڕێـکەو هۆیەکی تایـەتی داهاتبوو ، لەئەنجامدا لە ڕۆحی ئاینی ئیسلام‌و سوننەتی پێغەمبەرو بیرو هۆشی ڕاست‌و ڕەوان دوور دەکەوتەوە •

ڕێبازی ( وحدة الوجود )[١]ی بە تەواوەتی لە ناویاندا بنـــەبڕ کرد •• لەم ڕەت کردنەوەیەیدا بەڵـگەی زانستی‌و عەقلی ، بە چەشنێکی ڕێك‌و پێك‌و مەتینقیانە پێش‌کەشی دەکرد ، تا لە ئەنجامدا شۆڕشـێکی فـکری ئاینی نوێخوازانەی بۆ هەڵگیرساندن‌و گۆڕانکاریەکی چاکی کردو ئەو بارو دۆخەی لە ڕەگ‌و ڕیشەوە گۆڕی •

ئاکامی ئەو هەوڵانەی ئیمـام بوو یەکێـکی وەکو سوڵتان ( محی الدين اورنك زيب عالمگير )ی بەرهەم هێنا ، کە سوڵتانی هـــەموو هیندستان بوو بێ‌گومان گۆڕینی کۆمـــەڵ بەرەو چاکـــە ، دەبێت سوڵتانێکی چاك بێتە بەرهەم ـ ئـەم سوڵتانە خـۆی خاوەنی هـــەموو بڕیارێـکی ڕامیاری‌و ئیداریش بوو ، هەروەها ( حكيم الاسلام الأمام ولي الله الدهلوي )و خەلیفەو قوتابیەکانی هەموویان سەر بەم زنجیـرە زێڕینیەی ئیمامی سەرهەندی بوون‌و ، بە بەرهەمی بزوتنەوەکـەی دادەنرێن • هەروەها ئەمانە بوون مەزنانە تێکۆشان بۆ بڵاوکردنەوەی بەرنامەی قورئان‌و ، سوننەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم •

---

(١) . لە ژمارە یەکی ئەم زنجیرەیە کە ( مەولانای ڕۆمی )یە لـــەوەی تێدا ئاشکرایە مەولانا هێرشی بردۆتە سەریان • لە ژمارە دووشدا کە ( شێخی گەیلانی ) یە بە درێژی باسی (وحدة الوجود) کراوە•

قوتابخـــانەیەکی زۆریان دامـــەزراندووە بۆ خوێنـــدن‌و پەروەردەکردنی ڕۆحی‌و خـــاوێن کردنەوەی دەروون‌و ڕاست کردنەوەی بیرو باوەڕو ، بەربەرەج دانەوەی بیدعەت‌و ئەفسانەی ئـەو سەردەمە . قوربانیەکی زۆریان داوە لە پێناوی مانەوەی ئیسـلام لـــە هیندستاندا .

بەڵێ ئەمانەی باسمان کردن هەموویان ڕاست‌و تەواون ، بەلام ئەو خاڵە سەرەکی‌یەی کە هەموو تێکۆشان‌و هەوڵدان‌و چاکەکاریەکی لە دەور دەسوڕێتەوە کامەیە ؟

بۆ وەلام دانەوەی ئەم پرسیارە چەند ڕایەکی جیاواز هـــەیەو وەلامدەرەوان بوون بە چەند بەشێکەوە ، بەلام ئێمە وەلامی سێ ڕایان هەڵدەبژێرین :

**(١) یەکێك لـەو ڕایانە دەڵێ :**

ئیمامی سەرهەندی هەقی خۆیەتی بە نوێخـوازی هەزاری دووەم ( مجدد الالف الثاني ) وەسف بکرێت ، چونکە هیندستانی هێنـــایەوە ژێر ئالای ئیســـلام ، نەیهێشت بـکەوێتە باوەشی بورهمیەکـــان‌و فەلسەفەی ( وحدة الادیان ) ، بەڵـکو هیندستانی بەرەو ئالای محمـد صلی الله علیه وسلم سەر لەنوێ ئاراستە کردەوەو ، گـــەلی هینـدی پاراست لـــە مەترسی پاشگەزبوونەوەیان لـە ئیســـلام ، کـە ئـــەم پاشگەزبوونەوەیە خەریك بوو ببێتە بیروباوەڕێك ، بەهۆی زیرەکی ( الملك اکبر )و یارمەتی دوو ڕاوێژکەرە فێڵبازەکەیەوە ( مبـــارك )و ( فیض ابی الفضل ) خەریك بوو بە تەواوەتی تەشەنە بکات .. چونکە لە ڕاستیدا ئەو گۆڕانی ڕۆحی‌و مەعنەوی‌و پاشگەزبوونەوەی فیکری‌و

شارستانێتی‌یەتە ، زۆر ترسناکترو ناڵەبار ترو خراپترە ، لەمەو لەناو چوونی دەوڵەت‌و ڕووخاندنی باری ڕامیاری‌یەی لە کۆتایی سەدەی هەژدەمو سەرەتای سەدەی نۆزدەی زاینی ڕوویدا ، ئەویش ئەوە بوو کە هێزەکانی غەیرە ئیسلامی لە هیندستاندا ڕاپەڕین‌و ئینگلیز دەستی بەسەر وڵاتدا گرت ، لەوانەیە دکتۆر ئیقبال مەبەستی لەم ڕاستی‌یەیە کە دەڵێ :

« ئەو پارێزەرەی پێویست بوو گەلی ئیسلامی لە هیند بپارێزێت ، خوای گەورە لە کاتی خۆیدا نارد بووی وکردی بە پاسەوانی ئاینی پیرۆز » .

(٢) ڕای کۆمەڵی دووەم دەڵێ :

نوێکاریەکەی ئیمامی سەرهەندی لەوەدا بوو توانی چارەسەری ئەوە بکات ، فەزڵی شەریعەت بدات بەسەر تەریقەتداو دەری خست کە تەریقەت هەمیشە شوێنی شەریعەت کەوتووە نەك سەربەخۆ بێت .. بە توانایی‌و لێهاتوویی‌یەوەو لەبەر تیشکی ئەزمونی کەسێتی خۆیەوە بەو شێوازە تایبەتمەندیەیەوە توانی ڕوونی کاتەوە بۆ هەموو خاوەن بیرێك‌و بۆی دەرخات کە تەریقەت هەمیشە خزمەتکاری شەریعەتەو ، توانی ئەو فیتنە ترسناکە ڕابگرێت لە ناوەندی ( سلوك‌و تەریقەتدا ) بەرپا بوو بوو ، هەندێك جار داوای ئەوەیان دەکرد لە شەریعەت جیا ببنەوەو وازی لێ بهێنن .. تاوەکو هەموو هێزو توانەی خۆیان بخەنە سەر وەرزش‌و موجاهەداتی ڕۆحی‌و هۆشیاری دەروونی ، ئەم بیروڕایەش یەکەم جار لە هیندستاندا بڵاو بۆوە چونکە مەڵبەندی ( یۆگاو ڕەبەنیەت ) بوو .. تا وای لێهات بەهۆی تێکۆشانی ئیمامەوە کەس نەیدەتوانی بڵێ : ( شەریعەت لە دۆڵێکەو تەریقەت لە دۆڵێکی ترەو ، شەریعەت مافی چاودێری کردنی تەریقەتی نیە ) .

(٣) ڕای کۆمەڵی سێیەم دەڵێ :

سەزنی نوێکارە سەرەکی‌یەکەی ئیمام لەوەدایە توانی عەقیدەی ( وحدة الوجود ) بنەبڕ بکاو نەهێڵێ جارێکی تر سەر هەڵبداتەوە ، فەلسفەکەی هەر لە بناغەوە بڕوخێنێ بە چەشنێ تا ئێستا کەس نەیتوانیوە ئەم کارە بکات ، بە جۆرێك بەربەستی ئەو لافاوەی کرد ، کە هەموو عەقیدەیەکی ڕاست و ڕەوانی لەگەڵ خۆیدا لول دەدا ، ئەگەر بێتو زانایەکی ڕۆشنیر بەرپەرچی ئەو بیروڕایانەی بدایەتەوە دەکرا بە بەڵگەی نەزانی ئەو زانایە وەکو بلێی لە ڕۆژی نیوەڕۆدا ئینکاری بوونی خۆری کردبێت هەروەکو عەلامە ( مناظر احسن الکیلانی ) لە وتارە مەزنەکەیدا بە ناوی ( المآثرة التجدیدیة للألف الثاني ) ڕاستی وتوە کە دەڵێ :

پیاوچاکی و چاکەکاری ئیمامی سەرهەندی تێکەڵاوی لێکۆڵینەوەو وردبوونەوەی ( وحدة الوجود ) و ( وحدة الشهود ) و توێژینەوەی فەلسەفیەکان و شەڕە قسەی نێوان شێخ و سۆفیەکان بوو بوو لەسەر تەریقەت و شەریعەت ، لەناو ئەو هەموو هاژو هوژەدا هەمیشە ناوی بە نوێخوازی هەزاری دووەم دەهێنرا .

## زیندوکردنەوەی متمانەو باوەڕ بە پێغەمبەرێتی موحەممەدیو نەمری پەیامی ئیسلام :

لە ڕاستیدا نوێکاری یە سەرەکیەکەی ئیمام ، کە تێکڕای چاکە کاریو نوێکاریەکانی تری بە دەوردا دەسوڕێتەوەو ، ئەو سەرچاوە ڕەسەنەی کە گشت کانی چاکەکاریو تێکۆشانە شۆڕشگێڕیەکانی تری لێ هەڵ دەقوڵیو دەبێتە ڕووبارو بە ناو گشت جیهانی ئیسلامیدا تێپەڕ دەبێت ، بریتیە لەو چاکە کاریە مەزنەی ڕەنگی لە گەڕاندنەوەی متمانەو باوەڕ لە ناو دڵی گەلی ئیسلامدا دایەوە ، متمانەو باوەڕ بە پەیامەکەی محمد صلی الله علیه وسلم کە پەیامێکی نەمرەو تا لەسەر ئەم زەویەدا خەڵك مابێتو لە دنیادا ژیان مابێت ، پێویستیان بەم هەیەو هەر دەیان بێت ، ڕەگی عەقیدەی ئیسلامی بە تەواوەتی لە دڵیاندا بەهێز کرد . بەڵێ ئەم هەنگاوە نوێخوازیە بوو بووە بەربەستێکی پتەوو لەبەرەو ڕووی ئەو فیتنەیە وەستایەوە کە لەم پەڕەوە بۆ ئەوپەڕی جیهانی ئیسلامی شەپۆلی دەدا ، فیتنەیەك بوو وا دەمی کردبۆوە ، تا بە تەواوەتی درەختی ئیسلامی پیرۆز بە بنزامە بیروباوەڕیەکەیو لایەنە ڕۆحیەکەیشیەوە هەڵ لوشێت . پێشەنگی ئەم فیتنەیەش بزوتنەوەی (نقطوی) بوو ، ئەوان بوون ئاڵای شۆڕشیان هەڵگرتبوو دژی پێغەمبەرێتی

محمد صلى الله عليه وسلم و بەبێ پەردەو بە ئاشکرا بانگەوازی ئەوەیان دەکرد ، دەبێ سەردەمێکی تری ئاینی نوێ دەست پێ بکات و دەبێ شێوازی ژیان بە جۆرێکی تر داڕێژرێتەو ، نوێ بکرێتەوە ، تەنها متمانەی لەسەر عەقڵ و فەلسەفە بێت و بەس ، پێشەوای ئەم بزوتنەوەیەش ( محمد الیخانی ) و پاوان و شوێن کەوتوانی بوون ، مەڵبەندی بزوتنەوەکەش هیندستان و ئێران بوو • لە ئەنجامی ئەو فیتنە هەڵگیرساوەدا بوو ئاینی ئەکبەری نوێ و یاسا نوێیەکەی پەیدا بوو هەر کەسێ دەهات و دەیوت من جێی پێغەمبەرێتی موحەمەدیم گرتۆتەوە و جگە لە ئیسلام بەرنامەیەکی ترم پێیە • جا لە خۆیانەوە یاسایان بۆ دادەناو فیقهی تایبەتی و سەربەخۆیان بۆ دەنوسیەوە کەجی لە بنەڕەتدا دژایەتیەك بوو بەرامبەر دوامین پەیامی پێغەمبەرایەتی دەکراە

یەکێك لەو ڕێبازانە ( وحدة الوجود ) بوو بە ئاشکرا بانگەوازی بۆ دەکرا ئەوەیشی باوەڕی پێ بکردایەو لەسەری بڕۆشتایە ڕۆژ بە ڕۆژ باوەڕی بە ئیسلام و بەرنامەکەی کز دەبوو •

ڕێبازێکی تر لەو ڕێبازانە فیرقەی ( الأمامية ) بوو کە عەقیدە سەرەکیەکەی بریتیە لە ( الأمامة ) بە چەشنێکی وا وەسفی ئیمام دەکاو خاسیەتەکانی دەردەخات بە ڕادەیەك لە پلەو پایەدا دەیگەیەنێتە پێغەمبەرێتی ، بیروباوەڕی ئەم فیرقەیە لەوەدایە کە کۆمەڵێکی زۆر لە هاوەڵانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم گومان دەکرێت لە ئیمانەکەیان و هاوڕێیەتی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هیچ جۆرە کاریگەرێتییەکی نەبووە لە سەریان و ، ئەو پەروەردەیەی کردوونی بە شێوەیەکی کەم و کورتو ناتەواو بووە •

لە ڕاستیدا ئەم بیروڕایەیان پێچەوانەی ئەو ئایەتەیە کە دەفەرموێ

( هو الذي بعث في الأميين رسولا منهم يتلو عليهم آياته ويزكيهم ويعلمهم الكتاب والحكمة )(١) ..

شوێنەواری ئەم فیرقەیە لەبەر چەند هۆیەکی ڕامیاریو زانیاری جۆر بە جۆرەوە ، زۆر بەخێرایی لە هیندستانو کۆمەڵگای ئیسلامی بڵاو دەبۆوە ، سەرەڕای ئەوەی زۆربەشیان سوننی مەزهەب بوون ، کەچی لە ڕووی عەقیدەو بۆ چوونو لێکدانەوەو ڕاو دابو نەریتیان کاریان تێ دەکرا .

بەم جەشنە ئیمامی سەرهەندی توانی بە کلیلی نوێخوازیو نوێکاریەکەی باوەڕ بە محمد صلی الله علیەوسلمو متمانە بە پەیامەکەی سەر لەنوێ بکەشێنێتەوەو تیشکو گڕنگی خۆی بهاوێژێتو ، دڵە مردووەکان زیندووکاتەوە ، کە بەهۆی فەلسەفەی یۆنانیو ئێرانیو ئیشراقی میسرو(١) هیندەوە داهاتبوون . بە تیریکی یەکەرو هاویشتنێکی کوزەر سەرچاوەی ئەو فیتانەی مەبەستی جێی ڕۆشنیر بوو هەمووی وشك کردو فڕتەی لێ بڕی .

---

(١) سورەتی جومعە ئایەتی/٢ .

(١) بڕی دموترا ( الأفلاطونية الحديثة ) مەلبەندەکەی ئەسکەندەرییە بوو ، جگە لەوە میسریش مەلبەندێکی گەورەی ئەفلاتونی نوێ بوو ، لەوێـدا فلاطینسو بارفریو برۆکلس پێگەیشتنو قوتابخانەیەکی ئەفلاطونی نوێی تریان دامەزراند .

## کۆڵەواری کەشفو عەقل :

ئەو نوێکاریەی ئیمامی سەرهەندی پێی هەڵساوە ، بریتی بوو لە سەلماندنی کۆڵەواری عەقڵو کەشفو ، کەمو کورتیان لە زانینی کاروباره غەیبی‌یەکانو ، زانیاریەکانی پاش عەقل ، هەروەها کۆڵەواریان لە ناسینی سیفەتەکانی تەواوی-زاتی خوای گەورەو ، بە دەست هێنانی زانیاریەك کە ئیتر هیچ گومانو دوو دڵی‌یەکی تێدا نەمێنێ ، هەروەها کەرەستەیەکی ناتەواون بۆ زانینی ئەو حەقیقەتە سەلماوو چەسپاوانەی کە ئیتر هیچ جۆرە گومانێکی تێکەڵاو نەبێت بگاتە ئەوپەڕی یەقین ... کەچی ئەو ئەنجامانەی بە هۆیانەوە دەست دەکەون لە گومانو دوو دڵی خاڵی نین ، لە هەڵەو لادان پێ بەری‌نین ، لە تێك‌دانو خراپ تێگەیشتنیش بە دوورنین .. بەڵێ ناسینو زانینی ڕاستەقینەی تەواوی زاتی خواو سیفەتەکانی تەنها لە ڕێی پێغەمبەرانو نێرراوانەوە نەبێت دەرکی پێ ناکرێت ، ئەگەر عەقل لە سەرووی قۆناغی هەستەوە بێت،ئەوا پێغەمبەریتی لە سەرووی قۆناغی عەقلیشەوەیە..هەروەها هیچ ڕێگایەك نیە بە تەواوەتی بتوانرێ لەڕێیەوە ستایشو سوپاسو بەگەورەو پیرۆزکردنی خوای پێ بکرێ تەنها لە ڕێی پێغەمبەریتی‌و ، پەروەردەی پێغەمبەرانو هاوەڵەکانیانەوە نەبێت . هەر لەبەر ئەمەیە کە

فەیلەسوفەکانی یۆنانی توشی پێهەڵوتاندنێکی زۆرو هەڵەی گـــەورە گەورە بوون ، هەروەکو چۆن عەقڵی ڕووتو پوختە نیە ، بە هەمـــان شێوە کەشفی ڕووتو پاڵفتە دەست ناکـــەوێت • ئەو کەشفانەی لــە کاریگەرێتی دەرەکیو ئارەزووی دەروونی بە دوور بێت هەرگیز دەست ناکەوێتو بوێشی نیە ، هـەر بۆیەشە ئیشراقیەکانو خـاوەن دەروون ڕوونو ڕۆح بەرزەکـــان پێیان هەڵخلیـسکاو شوێن وەهمو نەزانی کـەوتن ، هەروەکو چۆن پێشەنـگانی عەقڵو فەلـسەفە لەم بوارانەدا پێیان هەڵخلیسکاوە • عەقڵو ئیشراقیەت بە تەنها داد نادات بۆ گەیشتن بە خوای گەورەو یەقین بەدەست هێنان •

محمد صلی الله علیه وسلمو پەیامی پێغەمبەرێتی‌یەکەی تاکـە هۆیە بۆ ناسینی زاتی خواو سیفاتەکانی •• ئیمام زۆر بەجوانی ئەوەی ڕوون کردۆتەوە کـە مەحاڵە عەقڵ بە تەواوەتی لــە هەموو تاریکێك ڕوون بێتـەوەو بـە پوختــەیی بمێنێتەوە •• چونـکە عەقڵیش هـــەروەکو هەستیارەکانی تر کاری تێ دەکرێت لە لایەن ئەو عەقیدەو بیروڕایانەی لە ناخیــدا پێی قایل بووەو ، هەروەها لەلایەن دەوروبەرو ، هۆکـارە دەرەکیەکانی تریش کاری تێدەکرێتو ، ئەمجا زۆربەی لێ وەرگرتنو وردبوونەوەو هەڵـکۆزینی بڕیارەکـــانی بەڕەنـگی ئەو کارتێکردنە دەرەکیانە ڕەنگ دادەڕێژرێت ، چونـکە ئەو هۆکارو کاریگەرانەی کە لە هەناوو دەروونیدا هەن لەگەڵ یەکتردا یەك دەگرن •• جا بۆیە بەڵگەو سەلماندنی عەقڵی ناتەواوەو ، بەڵـکو پەیامی پێغەمبەرانە بە بەڵــگەی تەواوو بێ کەمو کووڕیدا دەنرێت ، بۆیە خاوێن کردنەوەی تـەواو و ڕاستەقینە لە ڕێی ئەم پەیامانە نەبێت پەیدا نابێت •

زۆر بە جوانی ئەوەی ڕوون کردۆتەوە .کە دەڵێ : « هـەر کاتێ

پێغەمبەرێتی پێغەمبەران خرایە ژێر تیشکی عەقڵەوە ، ئەوە ئینکارکردنی پێغەمبەرێتییە • چونکە لەگەڵ عەقڵ نەگونجان شتێکەو ، لە تواناى عەقڵدا نەبوونەو لە عەقڵ بەدەر شتێکی ترە • •

بەڵێ لە ڕێگەى نورى پێغەمبەرو بە یارمەتی کەشفو عەقڵەوە توانی دەروازەیەکی نوێی وردبوونەوەو بیرکردنەوە واڵا بکاتەو زۆر لەو بیروڕایانەى لە ناوەندى زانستی عەقلیەکانی ئەو کاتە بە حەقیقەت دەدرانە قەڵەمو ، لەو کاتەدا باو بوون ، توانی بە درۆیان بخاتەوەو ، ئەمجا پڕ بەدەم بانگەوازى بۆ مەزنی پێغەمبەرێتیو شەریعەتی ئاسمانی داو ، ڕاستێتیو گەورەیی دەخستە ڕوو ، متمانەو باوەڕى سەر لە نوێ بۆ گەڕاندنەوە •• بەڵێ ئەمەیە ئەو شۆڕشە نوێخوازو نوێکارو زانستییە وردەى کە لەدایك بووى بەرنامەو خوێندنی بلاوى ئەو سەردەمە نەبوو بەڵکو خۆى داهێنەرى بوو و ، زادەى مێشكو بۆچوونو لێکدانەوەى خۆى بوو ، بەڵکو چارەسەرى بۆ زۆر شتی تر دانابوو کە ناوەندە عەقلیو فەلسەفیەکانی ئەو کاتەش هێشتا پێی نەگەیشتبوون پاش چەند سەدەیەکی تر ئەمجا پێی گەیشتوون •• بەڵێ ئەمەش قەدەرى خوایە کە پیاوێکی وا هەڵدەبژێرێت تا بێتە نوێخوازى هەزارى دووەمی کۆچیو شۆڕشێکی فیکریو بیرو باوەڕى بەسەر ئەو کۆمەڵگایەدا بکاتو ئاراستەى ژیانیان بەرەو ڕاستە شەقامی ئیسلام وەرچەرخێنێت •

## پرسیارە بنەڕەتیەکانو وەڵامدانەوەیان :

ئەو پرسیارە بنەڕەتیو سەرەکیانەی سەبارەت بەئاینو بوونەوەر دەکران ، پرسیارێك کـە پەلێو پێـکی ژیان ، متمانەیان دەخاتە سـەرو بەختەوەری یان سزای ئاخیرەتو ڕزگاربوونی لەسەر وەستاوە ئەمانەن: بەدیهێنەری ئـــەم بوونەوەرە کێیە ؟ سیفاتو ڕەوشتەکانی چیـــن ؟ پەیوەندی بە ئێمەوە چۆن چۆنیە ؟ پەیوەندی ئێمە بەوەوە دەبێ چۆن بێت ؟ چیەتی ئەم پەیوەندیە چۆنە ؟ ئەو کاروبارانەی پێی خۆشـەو لێی ڕازی دەبێت ، یان ئەوەی پێی خـۆش نیـــەو ڕازی نیـــە لێی کامانەن ؟ ئایا پاش ئەم ژیانەی ئێستا ئاخۆ ژیانێکی تر هەبێت ؟ جا ئەگەر هەیە دەبێ سروشتیو چیەتیەکەی چۆن چۆنی بێت ؟ ئایا ئەو تەعـالیمو ڕێنمایانەی پێیەوە پەیوەستن کامەن ؟

جـابۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە بە وردیو بە دوورو درێژی ئەوا پێویستە وەڵامدەرەوە ، باسێکی زاتی خواو سیفاتو کردارەکانیو ، سەرەتای دروست بوونی گێتی یان کۆنیو ، بوونی بەهەشتو دۆزەخو سروشو مەلائیکەتو زۆر بابەتی تر بـکات کە ئەمانە هەموو پەیوەندیان بەو دیو سروشتەوە هەیە ، لەگەڵ ئەوەشدا پایەیەکی بەرزی لە بنەڕەتی

عەقیدەو ئوصولە سەرەکیەکانی ئاین داگیر کردووە .

جا خۆخەریك‌کەران بەم بابەتانەوە وەڵامدانەوەیان‌و ئاسـان‌کردنی ئەم گیروگرفتانە بە شێوەیەکی گشتی ڕێـگای دوو جۆرە ئەزموونیـــان گرتەبەر ، ئەزموونی عەقڵ‌و ئیدراك‌و ئەزموونی ڕۆحانی‌و ئیشـــراق ، ئەنجامی ئەزموونی یەکەمیان فەلسەفە بوو ئەنجامی ئەزموونی دووەمیـان پەیدابوونی تەصەوفی ئیشراقی بوو .

بەڵام ئەم دوو جۆرە ئەزموون‌و هەوڵانە ، بەپێی بنەمای ڕەخنـەی مەوزوعی‌و زانستیانە لەسەر بناغەیەکی هەڵەو ناڕێکی دامەزرا بوون .

## هەنگاوێکی نوێکارانە :

له بابەت ڕەخنەگرتن له عەقڵی ڕووت‌و کەشفی بێ تەم‌و مژ
پێویستە لە پێش هـــەموو شتێکدا ئەوە بزانین کـــە عەقڵ بە هیچ جۆرێك سەربەست‌و ئازاد نیە بە جەشنێکی ڕەها ، لە بەجێ هێنانی کـاره سروشتی‌یەکانی وەك پشکین‌و لێکۆڵینەوەو بەڵـگە هێنانەوە بەڵـــکو پێویستی بە شتێك هەیە بۆ ئەم کارانەی کـە نرخی زۆر لە خۆی ترمتر‌و بێ‌بایەخە لە چاو عەقڵ خۆیدا ، چونکە ڕۆڵی بنەڕەتی لەوەدایە کە بکات بەشتی نەزانراوو هەست پێ نەکراو لە ڕێـگای هەست پێ‌کراوو زانراوو تاقی‌کراوەکان ، ئەویش بەهۆی ڕێکخستنێکی زانستیانەو پشت بەستنە بە زەخیرەی ئەم زانراوو بنەماو پێشەکی‌یانە تا بکات بە ئەنجامێك کە لەوەو پێش نەزانراوە بۆ نموونە : گیاندار بە تەنهاو بێژەر بەتەنها زۆر دوورن لەیەکەوە بەڵام دەتوانین لەم دوو وشە مانادارە شتێکی تر بێنینە بەرهەم کـە لەوەو پێش بۆی نەچووین وەکـــو ( مرۆف گیاندارە ) ( مرۆف بێژەرە ) ، کـەواتە لێرەدا دەگەینە ئەوەی کە مرۆف گیاندارێـــکی بێژەرە ... کەواتە هەر کاتێ وترا گـــیانداری بێژەر مەبەست لـــە مرۆفـــە ...

جا ئەگەر بێتو ئێمە هەموو ئەو مەعقولاتانەمان خستە ژێر تیشکی ڕەخنەو شیکردنەوە ، بە چەشنێکی زانستیانە ، بۆمان دەردەکەوێت کە عەقڵ نەگەیشتۆتە ئەم ڕاستەیە وردو زانیارییە بەرزانە تەنها لە ڕێگای ئەم هەست پێکراوو ئاسایییانەوە نەبێت .. کە خۆی بە تەنها نەیدەتوانی بەبێ یارمەتیدانو ڕێکخستنێکی عەقڵیو زانستیانە بگاتە ئەم ئەنجامە بە نرخو پڕ بایەخانە .

جا ئەوەی کە دیاردەیەکی بەڵگە نەویستە ئەوەیە ئەو بوارانەی هەستیارەکانی ئادەمیزاد نەتوانێ تیایاندا کار بکاتو ، هیچ جۆرە باڵپشتێکی نەبێت بۆ مەعلوماتە بنەڕەتیەکانیو ، ئاگای لە بنەماو سەرەتاکانی نەبێت ، ئەو کاتە هیچ جۆرە پێوانو تاقیکردنەوەیەکی لەو بوارەدا نابێت بۆ زانینی حەقیقەتەکەیو ، هیچ جۆرە ماوەیەکیش نیە بۆ پێوانە کردنیان ، جا ئیتر عەقڵو زیرەکیو پێوانەو هەڵەنگاندن چۆن دەتوانێ تیایدا هاتو چۆ بکات .

عەقڵ زۆر کۆڵەوارە لەوەدا بگاتە هیچ جۆرە ئەنجامێکو لە بەرامبەریدا بە باڵ شکاوی دەمێنێتەوە ، هەر وەکو چۆن مرۆڤ بە بێ کەشتی ناتوانێ لە دەریادا بپەڕێتەوەو ، بە بێ فڕۆکە ناتوانێ بە بۆشایی ئاسماندا بفڕێت ، خەڵکی هەرچەندە زیرەکو لێ زان بن ، ناتوانن مەسەلەیەکی ماتماتیکی شیکار بکەن ئەگەر لە ژمارەو بیرکاریدا هیچ نەزانن ، هەروەها ئەگەر کەسێك ڕێنوسی یەکێك لە زمانەکانی جیهان نەزانێتو پیتەکانی نەناسێت بێگومان تەنها دێڕێکیش لەو زمانە ناتوانێ بخوێنێتەوە هەرچەندە لە لایەنی ترەوە زیرەکو بلیمەت بێت ، هەرچییەکی لە بارەدا بێت لە عەقڵو پێوانەو هەرچەندە تێبکۆشێو هەوڵ بدات هەر ناتوانێ بیخوێنێتەوە هەر لەسەر ئەم ڕێنمایە

عەقلیش مەحاڵە بە تەنها بتوانێ وەڵامی ئەو جۆرە پرسیارانە بداتەوە ، چونکە ئادەمیزاد سەرەتاو بنەماکانی نازانێت ئەویش پێوانەو هەڵسەنگاندن وەرناگرێت •

حەقیقەتی دووەم ئەوەیە کە هێزی عەقڵو سنوری جوڵانەوەی تەسكو دیاری کراوەو ناتوانێ لەوە زیاتر لابدات ، هەر وەکو چۆن هێزی هەستوەری لە مرۆڤدا سنوورو بواری تایبەتی خۆی هەیەو ناتوانێ لەوە زیاتر بڕوات ، هەستی بینایی بە هەزاران شتی بینراو دەبینێت ، بەڵام ناتوانێ هیچ بیستێ ، هەستیارەکانی تریش هەر بەم چەشنەن ، ئەمجا هێزی ئەم هەستیارانە کارکردنیان لە میانەی تایبەت بەخۆیان سەبارەت بە هەستپێکراوەکان ڕەها نیە ، بەڵکو سنووردارە •

عەقڵیش هەر بەم چەشنە لەگەڵ ئەوەشدا کە بوارەکەی فراوانترەو جنزەکەی پانو بەربترە لە هەستیارە دەرەکیەکانی تر ، بەڵام هێشتا هەر سنووردارەو لە قۆناغو توانای خۆی ناتوانێ زیاتر بڕوات ، ئینو خەلدون بە چەشنێکی زانستیانەی ورد ئەمەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە:

« عەقڵ تەرازوویەکی زۆر تەواوەو ڕێكو پێکە ، ئەحکامو بڕیارەکانی یەقینیو بێ درۆن ، بەڵام تۆیش تەماعی ئەوە نەنگرێت کە مەسەلەی تەوحیدو ئاخیرەتو حەقیقەتی پێغەمبەرێتیو سیفاتی خواو شتەکانی ئەودیو قۆناغی خۆی پێ بپێوێت ، ئەمە بە ڕاستی مەحاڵەو نەگونجاوە ، نمونەی ئەم جۆرە پێوانەی لە توانا بەدەر ، وەکو ئەو کەسەیە کە چاوی بە تەرازوویەك دەکەوێت زێڕی پێ دەپێوون تەماعی ئەوە ئەیگرێت بە هەمان تەرازوو کێوێکی پێ بپێوێت ، ئەوەش نە ڕاستیدا بەڵگە نیە بۆ ئەوەی کە ئەو تەرازووە لە پێوانە کردنیدا ڕاستگۆ نیە ، بەڵکو عەقڵ ئالێرەدا دەوەستێو ناتوانێ لە قۆناغو

سنوری خۆی تێپەڕ بکات ، تاوەکو بتوانێ بەم عەقڵەوە لە خوای گەورەو سیفەتەکانی تێ بگات ، چونکە عەقڵیش ئەتۆمێکە لە ئەتۆمەکـــانی بوونەوەرو لێی بەدەر نیە • •

حەقیقـــەتی سێیەم ئەوەیە ، هەرگیز بۆ عەقل ناگونجێ بـــە تەواوەتی ڕوون بێتەوەو هیچ جەشنە لەکەیەکی دەرەکی پێوە نەبێتەو ، لە بڕیاردانو ئەنجامداندا بێلایەنیەکی تەواوی هەبێت ، هـــەموو ئـــەو زانایانەی حەقیقەتی ئەمە دەزانن ئاگایان لێیەتی ، زۆر چـــاك دەزانن لـــەم جیهانەدا دەگمەنترین شتو دەستنەکەوتنی ( عەقڵی ڕووتو بالفتەیە ) چونـــکە زۆر زەحمەتە ڕزگـــار بوونو ئازاد بوونی لـــە تەئسیراتی عاتیفەو ئارەزوو ، مەیلو نەزعەو کارتێکردنی دەوروبەرو ، پەروەردەی تایبەتیو ، دیراسەی تایبەتیو ، عەقیدەو تیۆری تایبـەتیو ، کاریگەریتی وەهمو خەیاڵو لەبیرچونو هەڵەکردن ، لەبەر ئـەو هۆیە زۆر دوورە ، هەموو کاتێ بڕیارەکانی ڕاست بێو ئەنجامەکانی حەتمیو یەقینی بێت •

بەڵام ئەوەی جێی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە فەیلەسوفەکان لەبەر چاو پۆشینیان لەم ڕاستیەیە ڕوونو ئاشکرایە ، هەموویان هەڵەیان کرد لە دیاری کردنی بابەتەکەیان ، هەستان گەڕانو بە شوێن زاتو سیفاتی خوای گەورەو ئەو شتانەیش کە پەیوەندی بە غەیبـــەوە هەیە ، بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە کەرەســەو پارچەیەکی ئەم بابەتانەیان بـــە دەســـتەوە بێت تا پشتی پێ ببەستن ، یان بێ ئەوەی زانیاریو بەصیرەتێکی وایـــان هەبێت کە بتوانن لەمانە تێبـــگەن ، هەروەکو لە ناو بازنەیەکی بۆش ( حلقة مفرغة )دا بسوڕێنەوە وایە •

لەگـــەڵ ئەم هەوڵە عەقڵیو فەلسەفیانەشدا ، هەوڵدانێکی تریش لە

ئارادا بوو ، ئەویش بریتی بوو لە (ئیشراق) ، بنەمای سەرەکی ئەم هەوڵەیان ئەوە بوو کە عەقڵو زانستو سەلماندنو بەڵگە هێنانەوە دادی گەیشتن بە یەقین نادات‌و ناتگەیێنێتە ڕاستی ، بەڵکو زیانی لە سودەکەی زۆرترە ، لەبەر ئەوە مەرجی سەرەکی بۆ ناسینی ڕاستی‌و حەقیقەت بریتی‌یە لە ( الشهود یان المشاهدة ) ـ بەچاوبینین ، ئەم دیتنەش لە ڕێی نوری دەروونو خاوێنی نەفسدا نەبێت بە دەست ناکەوێت ، ئەمەش بە زیندوکردنەوەی هەستیارە ناواخنیەکانی دەروون دەبێت تلوەکو حەقیقەتە ڕۆحی‌یەکانی ئەو دیو سروشتیش بناسێت • هەر وەکو چۆن ئەم چاوە دەرەکیانە شتە بینراوو دیارەکان دەناسێت ، ئەم هەستیارە دەروونیانەش بە لە ناو بردنی ماددیەت‌و مراندنێکی تەواوی هەستیارە دەرەکیەکان نەبێت بە دەست نایێت ، ئەم حیکمەتە ئیشراقیەو نورە دەروونیانە بە وەرزشکاری‌و خۆ پاکردنەوەو وردبوونەوەو چاودێری کردن پەیدا دەبێت ، ئەوا دەبێتە حیکمەتێکی پاک‌و بێ‌گەرد لە هەموو خەوش‌و پیسی‌یەکی دەرەکی ڕزگاری دەبێت‌و تاکە هۆیە بۆ حەقیقەت بە دەست هێنان •

بونی ئەم هەستیارە زیادانە شتێکی گونجاوەو هیچ گومانێکی تێدانیە ، بەڵکو لەوانەیە هەستیاری تریش هەبێت لەم چەشنانە ، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا ئەم هەستیارانە هەموویان هەستیاری ئادەمین‌و لاوازو سنوردارن ، هەروەکو هەستیارەکانی تر شیاوی هەڵەن‌و ، لەلایەن هۆکارە دەرەکیەکانەوە ـ هەروەکو هەموو هێزە ئادەمیەکانی تر ـ هۆیەکانی دۆزینەوەی زانیاری کاریان تێ دەکرێت • ئایا دەبێ چ بەڵگەیەك هەبێت کە بیسەلمێنێت ئەم هەستیارە سنوردار نەبو شیاوی هەڵەکردن نەبو هەستکردن‌و دیتەکانی توشی هەڵەو هەڵخەڵەتاندن‌و

لە خۆبایی بوون نایێت ؟ جا ئەگەر وا بوایە کە بە هەڵەدا نەچووبایـە ، دەبوایە لە ئەنجامەکانیدا هیچ جـۆرە دژو دژواریەك نەبوایەو هیچ جەشنە تێك چوونو بە هـــەڵەدا چوێکی نەبوایەو خـۆی تووشی هەڵخلیسکاندن نەکردایە لە مەسەلە گرنگەکانی ژیاندا ، هـــەروەکو چۆن لەواقیعدا دەیبینین •

بەهەر حاڵ ئەم حیکمەتە تایبەتمەندەش هەروەکو عەقڵ ، ئەمیش ناتوانێ بە تەواوەتی ڕوون بێتەوەو پاڵفتە بێت ، چونکە ئەمیش لە لایەن هۆکارە دەرەکیەکانو شتە دیارو نادیارەکانیش کـاری تێ دەکرێت ، سێەرو تارماییەکانیانی تێدا پێچەوانە دەبێتەوە ، لەگەڵ ئەوەشـدا ئەم ئاوێنەیەش هـــەر ناتوانێ بە شێوەیەکی ڕاستەقینە وێنـــە ڕاستیەکان بگرێت ، چونـکە مۆرکی شوێنەواری ئیشراقیو عەقیدەو بەڵگەکانیانی لە خۆ دەگرێت ، بۆیە زۆربەی ئیشراقیەکان لە کەشفەکانیاندا زۆر شت دەبینن کە هەمووی ئەفسانەو خورافیاتەو ، بە هیچ کلۆجێك عـــەقڵ پەسەندی ناکات ، جگە لە وەهمو خەیاڵ هیچی تر دروستی نەکردووەو زۆر فەرەزییەو تەخمینات وەکو ڕاستییەکی سەلمێنراو بەڵـگە نەویست لێك دەدەنەوە کە لە جیهانی دەرەوەیاندا هیچ بونێکی نیە •

ئەم مەسەلانەی پێشوو کە باسکران ، هەر وەکو چۆن لە سنوری فەلـەفە بەدەرن ، هەر بەم جەشنە لە سنوری ئیشراقیەکانیش بەدەرن ، لەوانەیە یارمەتی دۆزینەوەی نهێنیەکانی جیهـانی ڕۆح بداتو زۆر وێنەو نیـگار بینێت ، گوێی لــە دەنگێو سەدای زۆر بێت ، بەڵام نەزانێـکی تەواوە بە جیهانی بەڕێوەبەرایەتی خوای گـەورەو یاســاو ئەحکامو شەریعەتەکەیو ، بێ ئاگایەکی تەواوە سەبارەت بە هـەواڵو ڕاستیەکانی جیهانی ڕۆژی دوایی ، هـەر وەکو مرۆڤێکی ئاسـاییو

نەزان دەربارەی بنەماکانی ئیشراق .

لە ڕاستیدا فەلسەفەو ئیشراق یەك ڕوانگەو مەبەستیان هەیەو ، یەك جۆرە گیان بە سەریاندا زاڵ بووە ، ئەویش ئەوەیە هەردووکیان دەیانەوێ بگەنە حەقیقەت بە بێ یارمەتی پێغەمبەرانو نێرراوان ، هەردوو لایان یەك ئامانجیان مەبەستە ، هەرچەندە ئەو هۆیانەی دەیخەنە کار لە یەکتر جودایە ، یەکێکیان دەیەوێت بەسەر زەویدا بڕوات تا پێی دەگات ، ئەویتریان دەیەوێت بە بۆشایدا بفڕێت یان لە ڕێگەیەکی شاراوەی ژێر زەوییەوە پێگاتێ ، ئەمەشیان ڕێگای ئیشراقیەکانە .

لە ئەنجامدا دەبێ بەوە قایل بین کە حەقیقەتو ناوکرۆکی عیلمو عیرفان لەوەدایە هیچ جۆرە ڕێگایەك نیە بۆ گەیشتن بەم حەقیقەتو زانیاریانە تەنها ڕێگای پێغەمبەران نەبێت ، ئەو کەسانەی خوای گەورە فەزڵی خۆی بەسەرا باراندوونو بە پایەو پلەی پێغەمبەرایەتی شادی کردوونو گەورەترین بەشی زانستی لە بابەت زاتو سیفاتی خوای گەورەو مەلەکوتی ئەرزو ئاسمانی پێ بەخشیون ، بە بێ هیچ هۆیەکەوە ڕاستەوخۆ ئەوەی پێ ڕاگەیاندوون چی پێ خۆش نیەو ڕەزامەندی ئەو خوایە لە چیدا کۆبۆتەوە .. حەرامو حەڵاڵی پێ ناساندوون ، تا ئەمانیش ببنە هۆیەك لە نێوان خوای گەورەو خەڵکیدا ، بەڵێ پێغەمبەرایەتیو پەیامەکانیان ئاشکراو ڕوونە بە سەر خەڵکییەوە ، ئەو عیلمە مەزنەی دەربارەی زاتی خواو سیفەتە باڵاکانیو ناوە جوانەکانی بەبێ گیروگرفتو بێ بەرامبەریش بە خەڵکی دەبەخشن ، تەنها تۆزقاڵێك لەو زانستە ناتوانرێ لە ڕێگەی لێکۆڵینەوەو وردبوونەوەو توێژینەوەی فەلسەفیو بەڵگەهێنانەوە بە درێژایی هەزاران ساڵ بە دەست بهێنرێت ، تەنانەت لە ڕێگەی ڕیازەت کێشانو خاوێن

کردنەوەی دەروونو خۆ چاودێری کردنو بیرکردنەوەش بۆ چەندین ساڵیش ئەمجا هەر نایەتەدی ( ذلك من فضل الله علينا وعلى الناس ولكن اكثر الناس لا يشكرون )[1] سورەتی یوسف ئایەتی ٣٥ ٠

ئیمامی سەرهەندی لە هەردوو لایەنی ( فەلسەفە )و ( ڕۆحانیەت ) زانیارێکی قوڵو ، زانینێکی تەواوی هەبوو ، لە لایەکی تریشەوە میرات گری علومی پێغەمبەرانو نێرراوانو پیاوچاکانو ئەو زانایانە بوو کە ئاگایان لە پلەو پایەی سروشو پەیام بوو ٠ ٠ لەگەڵ ئەمانەشدا ڕەخنەگرتنی لە فەیلەسوفو ئیشراقیەکان ڕەخنەیەکی زانستییانەی مەوزوعی بوو ، ئەمەش بەڵگەیەکە لە سەر چڕو پڕی ئیمامو ڕۆچونی بە ناو زانستەکاندا ٠٠ ئەم بابەتە گرنگەیە کە خاڵی سەرەکیو تەوەرەی بنچینەیی کردارە نوێکارە مەزنەکەیەتی چونکە بناغەی شەریعەتەکەی خوایەو نیزامی ئاین بە گشتی لەسەر ئەم مەسەلەیە ڕاوەستاوەو بڕیاری بێ چەنو چوون لەمەدایە ٠ لێرەدا ئیمام پرسیار دەکاتو دەڵێت : ئاخۆ سەرچاوەی ڕەسەنو چاوگی سەرەکی بۆ بەدەست هێنانی زانستی تەواو و یەقیندار کە هیچ جۆرە گومانێکی تێدا نەمێنێتو ، زانینێکی پێویستی وا دەربارەی زاتی خــواو سیفەتەکانی ، سەرەتای هاتنە ژیانی ئادەمیزادو کۆتایی هاتنیو بەختەوەرییو ڕزگاری دەبێت کامە بێت ؟ ئاخــۆ دەبێت سەرچاوەکەی لێ وردبوونەوەی فەلسەفیو توێژینەوەی زانستیو بەڵگە هێنانەوەی مەنتیقی بێت ! یان نوری دەروونیو ، ڕەزمەت کێشانو پــاك کردنەوەی دڵو دەروونو ئەو دیتنو کەشفانە بێت کە بە هۆی هەستیارە دەروونیەکانو هێزە ڕۆحەکانەوە بە دەست دێت ؟ یان سەرچاوەکــەی

---

(١) ئەمە بەخششی خوایە بەسەر ئێمەو خەڵکیەوە ، بەڵام زۆربــەی کەسان شوکرانە بژێر نین ٠

شوێن‌کەوتی پێغەمبەرانەو بلوەڕ هێنانە پێیانو تەسلیم بوونە پەوان ؟! تا ئەمە ئەو پتەیە کە تولە ڕێگاکانی لێ جیا دەبێتەوە...ئەم سێ ڕێگایەش لەم لایەنەوە بە هیچ جۆرێك یەکتری ناگرنەوەو بە یەك ناگەن ... ( وان هذا صـــــراطي مستقيما فاتبعوه ولا تتبعوا السبل فتفرق بكم عن سبيله ، ذلكم وصاكم به لعلكم تتقون )[1] . سورەتی الانعام ئایەتی ١٥٣ .

---

(١) ئەمــــەیە ڕێــگەی ڕاستی من . شوێنی کەون ، شوێنی تولـە ڕێــگاکانی تر مەکەون ، چونــکە لەم ڕێگەی خوا دورتان دەخاتەوە، ئامۆژگاریتان بەمە دەکات بەڵکو بترسنو پارێزگار بن

## بۆچوونی فەیلەسوفە یۆنانیەکان سەربارەت بە ناسینی خوای گەورە :

بەرێوەبەرو بەدیهێنەری ئەم بوونەوەرە رێکو پێکە ، لـــە لایەن فەیلەسوفە یۆنانیەکان بە ( المبدأ الأول ) ناسراوەو ، گـــەڕان بـــە شوێن چۆنیەتیداو ، دروست بوونی ئەم بوونەوەرە بەفەرمانی ئەو چۆن پەیدا بووە ، جـا ئیتر ئـــەم فەیلەسوفانە گریمانیو خەیاڵاتی زۆریان دروست کردووە ئەمجا کۆشکی زۆر زلو زەبەللاحیان لەســـەر ئـەم خەیاڵو گریمانە دروست کردووە .

بەڵام ئیمامی سەرهەندی بەهۆی فیــکرە فراوانو زانیاریــە زۆرەکەی ، توانی بەربەرچی ئەم راو بۆچوونە سەیر سەیرانە بداتەوە.

بۆچوونی فەیلەسوفە یۆنانیەکان بەم جۆرە بووە :

( مەبدەئی یەکەم لە هەموو لایەکەوە هەر یەکە ئەوەیشی زانراوە لە یەکەوە هیچ پەیدا نابێت تەنها یەك نەبێت ، گیتی لە شتی جیاواز پێك هـــاتووە ، ناشـــکونجێ ئەمـــە کردەوەی خوا بێت ، لـە بوونی مەبدەئی یەکەمەوە عەقلی یەکەم پەیدا بووە ، ئەمەش بوونێکە خـــۆی خۆی رادەگرێتو پێویستی بە هیچی تر نیە ، نە تەنەو نە لـە تەنیشدا

نەخشێنراوە ، خۆیو مەبدئەکەیشی کــە لێوەی پەیدا بووە دەناسێت ، ناومـان ناوە عەقڵی یەکەم ، بۆ بوونیشی پێویست بە سێ شت دەکات :

عەقڵ ، نەفسی فەلەکی ئەویەڕ ( الأقصی ) ئەویش ئاسمانی نۆیەمە ئەستێرەکانی فەلەکی ئەویەڕ . ئەمجا وا پێویست دەکات لە عــەقڵی سێیەم نەفسی فەلەکیو کەوکەبو ئەستێرەکانی پەیدا بێت ، ئەمجـا وا پێویست دەکات لە عەقڵی سێیەمیشەوە عەقڵی چوارەمو فەلــەکی زوحەلو هەسارەکانی پەیدا بێت ، ئەمجا وا پێویست دەکـــات عەقڵی پێنجەمو موشتەریو هەسارەکانی پەیدا بێت ... بەم جەشنە تا گەیشتە ئەو عەقڵەی لەگەڵیدا عەقڵو فەلەکی مانگو هەسارەکانی پەیدا بێتو ، تا دەگاتە دوامین عەقڵ ئەویش پێی دەڵێن ( عەقڵی بەکار ـ العقـــل الفعال ) ... لەمەوە فەلەکی مانگ پڕکرایەوە ، کە ئەمەیش مـــادەی تەواو و بوونەوەرو ، تێکچوونە ، هەر لە عەقڵی بەکارەوە ســـروشتی فەلەکەکان هاتۆتە دی ، ئەمجا مادەکان بە پێی جوڵانەوەی کەوکەبەکانو بە شێوەیەکی جیا جیا تێکەڵاو دەبن .. ئەمجا لەمانەوە کانزاکــانو ڕووەکەکانو گیاندارەکانیش پەیدا بوون ، ... هتد . لەمەوە ئەوەی پەیدا بوو ئەوە دە عەقڵو نۆ فەلەکەکان )[1] .

لە هەر سەردەمێکدا بۆ ناسینی خواو هەر نادیارێـکی تر ئەگــەر پشت بە پێغەمبەرانو ئایین نەبەسترێ ناگەینە ئەنجام .. هــەر وەکو چۆن فەیلەسوفەکانی یۆنان نەیگەیشتێ ، لــە چــەرخی ڕاپەڕینی زانستیشدا نایـگەنێ بۆ نمونە : هیـگل کەوتۆتە هەمــان هــەوڵەوە کە ویستویەتی لە ڕێـگەی عەقڵی خۆیەوە خوا پێناسە بکات یان بەدیهێنەری

---

(١) رجال الفكر والدعوة ـ الأمام السرهندي ـ ابو الحسن الندوي

بوونەوەر بناسێنێ کە دەڵێ : ( فیکری موتڵەق بریتی‌یە لە فیکری ڕووتەو ، بیریش هەر لە فیکری ڕووت دەکاتەوە ) ، بۆیە (براتراندرسل) دەربارەی ئەم وتەیەی هیگڵ دەڵێ : (هیگڵ لێرەدا دەست بۆ ئەوە درێژ دەکات کە فیکری موتڵەق هەر وەکو خوایەکەی ئەرستۆ بیر لە هیچ شتێ ناکاتەوە جگە لە خۆی )[٢] .

ئەمەیە کە فەیلەسوفە یۆنانیەکان ناویان نلوە خوایەتی زانی ( علم الآلهیات ) .. خەڵکی بەوپەڕی ئیخلاص‌و چاپوکیەوە دەستیان بە ڕاوێژو لێکۆڵینەوە کرد ، تیایدا ، هەروەکو ئەفسانەیەکی خەیاڵاوی ، یان گریمانێکی وەهمی وابوو ، خێرا ئەو ئایەتەمان دەهێنێتەوە یاد کە خوای گەورە دەفەرموێ ( ما أشهدتهم خلق السموات والارض ولا خلق أنفسهم ، وما كنت متخذ المضلين عضداً )[١] سورەتی الكهف ئایەتی ٥١

( ئەو فەیلەسوفانە هەموو جەشنە سیفاتێکی جەلال‌و کەماڵیان لە خوای گەورە ڕووتانۆتەوە ، سیفاتی توانایی‌و هەڵبژاردنیان لێ سەندۆتەوە ، وایان سەلماندووە کە بێ‌گیانێکی بێ‌جوڵەو بێ‌کارە ، بە بۆچوونی خۆیشیان ئەمانەیان بۆ ئەوە کردەوە کە بیسەلمێنن ( واجب الوجود ) مەزنەو پیرۆزەو خاوێنە ، بۆیە لێرەدا ئیمامی غەزالی بەرامبەر بەم لێکدانەوانە ڕادەپەڕێ‌و دەڵێ : ( ئەوەی قایل بێت بەوەی کە خوای گەورە لەو پلەو پایەیەدا بێت ئەوا لە ڕیزی بێ بایەخترین شت دایناوە ، کە عەقلی بەخۆی دەشکێ‌و بە غەیری خۆی ناشکێ ، چونکە ئەوەی

---

(٢) الفلسفة والسياسة ـ برتراند راسل

(١) ( من دروست کردنی ئاسمانەکان‌و زەوی‌و دروستکردنی نەفسی خۆشیانم نیشان نەداون وە گومرایانم نەکردووە بە یارمەتیدەری خۆم ) .

عەقڵی بە خواو بەخۆی بشکێ ، دیارە لەو بەرزترو بەنرخترە ، جا کە ئەو هەر عەقڵی بەخۆی بشکێو بە تەنها خۆی بناسێت ، ئیتر ئەو قوڵ داچوونە بۆ مەزن کردنی خوای گەورە هەموو لایەنێکی مەزنێتی یان لێ تەکاندۆتەوە ، بەڵکو خستویانەتە پێزی مردوویەکەوە کە ئاگای لـــە جیهانی چوار دەوری نیە چی ڕوو دەدات ، تەنها ئەوەندەیە هەست بـە خۆی دەکات و ڕۆحی دەرچووەو لێی جیابۆتەوەو بەس )[1] ٠

تا لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت ئەو فەیلەسوفانەی لـــە زانـــــتی ماتماتیکی و زانستی تەتیقیدا تا چ ڕادەیەك سەرکەوتنی گەورەیان بـــە دەست هێناوە کـــەچی لـە زانـــتی خوایەتیـدا نەیانتوانی سەرکـــەوتن بەدەست بهێنن چونکە عەقڵی کۆڵەواری کورت بین لـــەم بوارەدا هیچ تێشویەکی نیە تا پشتی پێ ببەستێ ٠

ئیمام لەم بارەیەوە دەڵێ : ( ئەگەر عەقڵ بە تەنها بەس بوایـە بۆ ناسینی خوا ئەو کاتە فەیلەسوفەکانی یۆنانی ـ ئەوانەی عەقڵیان کردبووە پێشەواو پێش بینی خۆیان ـ بـــە سەرسوڕماوی لە بیابانی گومرایی وا نەدەمانەوەو هەروا بە ئاسانی سەریان لێ تێك نە دەچوو بەڵکو زاناترین کـەس دەبوون بـــە ناسینی خواو ، لە هەموو کەس چاکتریان دەناسی ، کەچی ئەوان لە هەموو کـــەس نەزانتر بوون بەزات و سیفات و ناوە جوانەکانی خوا ، بەڵکو ئەوان گومانیان وا دەبرد ، کـە خوای گەورە بوتێـکی بەتاڵ و بێ کاری هـــەیەو ، هەرگیز لەو بیرو بڕوایەدا نەبون شتی دروست کردبێت جگە لە عەقڵی بەکار ( العقل الفعال ) نەبێت ٠ ٠ ئەم عەقڵەیش بە ناچاری لە خواوە پەیدا بووە ، نەك لـــــە توانست و هەڵبژاردنی خۆیەو بوویێت ٠ ئەوان هـــــەر خۆیان بەهۆی عەقڵیانەوە ( عەقڵی بەکار ) یان داهێناوەو لـــە وەهەم و خەیاڵی خۆیاندا بوونیایان

---

(١) رجال الفكر والدعوة / الامام السرهندي ٠

داوەتێ ، ئەمجا دروستکراوەکان لە جیاتی ئەوەی بۆ لای پەروەردگاری بەرنەوە ، کەچی دەیگێڕنەوە بۆ لای عەقلی بەکار .. وا تێدەگەن ئەسەر ( الأثر ) بە هۆی موئەسیر ( المؤثر )ی ڕاستەقینەوە پەیدا نەبووە، بەڵکو بەهۆی عەقلی بەکاری دروستکراوی خۆیانەوە پەیدا بووە ، بەلای ئەوانەوە مەعلول ئەنجامی عیللەی نزیکەو عیللەی دوور هیچ دەخاڵەتێکی نیە لە دروستکردنی مەعلولی دوور ، وایان دەزانی ئەگەر ئەم کارانە نەدرێتە پاڵ خوای گەورە ئەوە ئەوپەڕی تەنزیهە کردنو مەزن کردنی پەروەردگارەو ، بێکاریو بەتاڵی لە ئیشو کار ئەوە ئەوپەڕی مانای مەزنێتیو خوێن ڕاگرتن دەگەێنێت ... کەچی لە ڕاستیشدا خوای گەورە خۆی وەسفی خۆی دەکات کە بەدیهێنەری زەمویو ئاسمانەکانەو پێناسەی زاتی خۆی دەکات کە دەفەرموێ ( رب المشـرق والمغرب ) .

ئەم هەزارانە بەخەیاڵی خۆیان وا دەزانن هیچ پێویستیەکیان بە خوای گەورە نیەو ، مل کەچیو سەردانەواندن بۆ خوای گەورە بە پێویستی نازانن .. کەواتە لە کاتی داخوازی ئاتاجیانو داواکاری پێویستیان بگەڕێنەوە بۆ لای عەقلە بەکارەکەیانو مل کەچی بۆ ئەو بنوێنن ، چونکە بە پێی بۆچونی خۆیان ئەو عەقلە خاوەن دەسەڵاتی ڕاستەقینەیەو ، توانستی تەواوی هەیە .

ئاخۆ ئەم عەقلە بەکارە چی بێت وا دروست کراوەکان دەدرێنە پاڵیو بە هۆیەوە دێنە بوون ؟ لێرەدا بەهەزاران ڕەت دانەوە هەیە لەسەر سەلماندنو بوونی ئەم عەقلە ، چونکە بوونیو چەسپاندنی لەسەر پێشەکیەکانی فەلسەفەی گریمان کراو ـ مقدمات فلسفیة مفترضة ـ ڕاگیرکراوە ، کە لەبەر ڕۆشنایی ئوصولەکانی ئیسلامو بنەما

چەسپاوەکانیدا ، کەم و کووڕو ناتەواوە... بەڵێ ئەو کەسەی شت لـــە دەستی خوایەکی بە توانای خاوەن ویست و هەڵ بژێرەوە دەستێنێتەوە و دەیداتە دەست شتێکی وەهمی و دروستکراو ئەوە بێ گومـــان تێ نەگەیشتووەو زۆریش دووورە لە ڕاستی ، بەڵکو ئەم شتانە خـــۆیان هەست بە شەرمەزاری و سەرشۆڕی دەکەن کە دەدرێنە پاڵ شـــتێك فەلسەفە خۆی دروستی کردووە لە واقیعیشدا هیچ نین ، بەڵکو ئەمـانە بە لەناوچوون ڕازی دەبن و شوکرانەی بەڵاو مردن دەکەن و ، نایانەوێ بژین و بمێننەوە لە پاڵ شتی گریمانی و وەهمی ، کە هیچ بوونێکیان لـــە بونەوەردا نەبێت ، لەو بەختەوەرییە مەزنەی کـــە بدرێتـــە پاڵ پەروەردگار بێ بەشیان دەکەن )[1] .

(۱) الرسالة رقم ۲۳ ـ المجموعة الثالثة ـ رجال الفكر والدعوة ابو الحسن النـــدوي .

## عەقل بە تەنها بەس نیە بۆ ناسینی ڕاستی‌یەکانی ئایین :

بە چ زبانێك سوپاسی خودا بکەین‌و چۆن ستایشی بکەین ، بەرامبەر بەو نیعمەتەی بێ‌ی بەخشیوین بەناردنی پێغەمبەرانو تێرراوان ، بە چ دڵێك ئەو پەروەردگارەمان خۆش بوێت ، کوا ئەو لەش‌و لارەی بـــە کردەوە چاکەکانی بتوانێ هەقی ئەو هەموو نیعمەتە مەزنانە بدات ؟ جـا ئەگەر ئەو خاوەن فەرو پڕ بەرەکەتە نەبوایە کێ ئێمەی ڕێنمایی دەکردە ئێمەی عەقڵ کورت بۆ باوەڕهێنان بە دروست‌کەری زەوی‌و ئاسمانەکانو باوەڕ هێنان بە یەکایەرستی ئەو بەدیهێنەرە ، فەیلەسوفە کۆنەکانی یۆنانی سەرەڕای بلیمەتی‌و زیرەکیان نەیانتوانی پەروەردگاری ڕاستەقینە بناسن، بەڵکو بەدیهاتی بوونەوەر یان گەڕاندۆتەوە بۆ ڕۆژگار ، بەڵام کـــە بانگەوازی پێغەمەران دەرکەوت بە تێپەڕ بوونی ڕۆژگار بۆ خەڵـــکی ئاشکرابوو حەقیقەت کامەیەو ، فەیلەسوفەکانی دوای ئەوان بە کاریگەری ئەم نورو بەرەکـــەتە ڕاپـــەڕین بۆ ڕەت‌کردنەوەی فەیلەسوفەکانی پێشوو و ، باوەڕیان بە دروست‌کەری حەقیقی ئەم بونەوەرە هێنـــا ، هـــەموویان یەکایی خوایان بڕیار دا ، چونـکە عەقڵ بـــە بێ نوری پێغەمبـــەران کۆڵەوارو کورت بڕەو ئیدارکمان بە بێ پێغەمبەران بێ تواناو لاوازە .

## قۆناغی پێغەمبەرێتی لە سەروی قۆناغی عەقلەوەیە

قۆناغی پێغەمبەرێتی پاش قۆناغی عەقڵو بیرکردنەوە دێت ، ئەو ڕاستییانەی عەقڵ لە ئاستیدا کۆڵەوارەو دەرکی پێناکات ، پێغەمبەرێتی دێتو لێکی دەداتەوەو دەیچەسپێنێت ، جا ئەگەر عەقڵ بەتەنها بەس بوایە ، ئەوا پێغەمبەران نەدەنێرران‌و سزای ئاخیرەت نەدەبەسترایەوە بەوانەوە ( وما كنّا معذّبين حتى نبعث رسولا )(١) .. عەقڵ حوججەیە، بەڵام حوججەیەکی ئەوپەڕی نیەو لە بەڵگەهێنانەوەیدا تەواو و کامل نیە ، بەڵکو حوججەی تەواو بە ناردنی پێغەمبەران‌و نێرراوان تەواو کرا ، ئەوجا قسەی خەڵکی بڕی‌و بەهانەیانی هیچ نەهێشت . خوای گەورە دەفەرموێ : ( رسلا مبشرين ومنذرين لئلا يكون للناس على الله حجة بعد الرسل ، وكان الله عزيزاً حكيما )(٢) .. کە کۆڵەواری‌و کەم‌و کووڕی عەقڵ لە هەندێ لەو بابەتەدا سەلمێنرا ، ئیتر ئەوە کارێکی چاك نیە هەموو ئەحکامەکانی شەرع بە تەرازووی عەقڵ بپێورێت . جا

---

(١) ( ئێمە سزا نادەین تا نێرراو نەنێرین ) .

(٢) ( نێراوان مژدەهێنەرو ترسێنەرن ، تا خەلکی هیچ بەهانەیەکیان نەمێنێ پاش ناردنی نێرراوان ) .

هەوڵدانی هەمیشەیی بۆ بەراوردکردن لە نێوان عەقڵو ئەحکامەکانی شەرعو خۆبەستن پێیەوە ، ئەوە دەگەیێنێ کە عەقڵ بۆ پێوانەی هەموو شتێك بەکارەو لە هەموو شتێکدا دەولەمەندەو ، ئیتر ئەمە دەکاتە ئەوەی ئینکاری پێغەمبەرایەتی بکرێت[1] .

(١) الرسالة رقم ٣٦ هەمان سەرچاوەی پێشوو .

## عەقڵ بە تەنها بەس نیە ئەگەر دەروونیش لە گەلیدا ڕۆشنو درەوشاوە بێت :

جا ئەوەی کە سەر لێی سوڕ دەمێنێو - ناتوانرێ تەئویل بکرێو لێکبدرێتەوە تەنها بەوە نەبێت کە بڵێت ئەمە بارمەتیدانێکی خوایی بووەو بزوتنەوەیەکی فیکریو ڕاستەو ڕایەکی ماقوڵانەی پەسەند بووە - لەو سەردەمەدا - سەدەی شانزەی زایینی - عەقڵانیەت بە جارێ باڵی بە سەردا کێشا بوو ، زانستیە عەقلیەکان بە تەئسیری بڕیارەکانی فەلسەفەو مەنتیق بەسەر هەموو لایەکـــدا زاڵ بوو بوو بەشێوەیەکی گشتیو بەســەر هیندستانو ئێراندا بە شێوەیەکی تایبەتی ، ئەوەیش بە تەنها بریتی بوو لە خوێندنی فەلسەفەی یۆنانیو ئەفلاتونو ئەرەسـتۆی هێندە بەرز کردبۆوە کە گەیاندبوونیە پلەی پیرۆزی بێ گوناهـی ، تەنانەت ئەو دەرەنجامە عەقلیانەی لە پێشەکی عەقلیو لەسەر ڕێبازی مەنتیقی دەست دەکـەوتنو باسکردنی ئەوانەی فەیلەسوفەکانی یۆنان ڕوونیـان کردبۆوەو بڕیاریان لەسەر داوە دەربارەی بەڵگە نەویستەکان کەزمانی پاراوی لێهاتووی لاڵ دەکردو چاوکراوانی کوێر دەکرد بەڵکو فەلسەفەو مەنتیق پەرستان بە ئارەزوو بێ زۆر لێکردن لەبەر دەم ئەم ڕاستیانەی ئەویان ناوە ڕاستی هەموو کڕنوشیان دەبرد ... تا لەم بارو

دۆخە ناڵەبارەدا بوو ، ئیمام دەنگی زوڵاڵی بۆ یەکەمجار لە سنورێکی زانستیانەدا لێ بەرزکردەوەو ، لە نێوان هەموو زانایانی ئیسلامدا وتی لێ کردنەوەی عەقڵو بجڕاندنی لە پەیوەستی جەستەیی یە ماددیەکەی و وەهەو تصوراتو عەقیدەکەی و ئەو سەلێنراوە باوانەی دەورووبەرو زەنگەکانی و ، ڕزگاربوونی لە مەیلی نەفسی و ئارەزووی دەروونی و ڕەوشتی جێگیر بوو و ، نەریتی دامەزراوو ، ڕەگ داکوتاو ، ئیمجە مەحاڵێکە ؟ تەنانەت ئەگەر ئیشراق و خاوێنی دەروونی لە ڕێگادا شان بەشان لەگەڵیدا بێ و ، دەستی یارمەتی بۆ درێژبکا ، چونکە گەیشتی بە شێوەیەکی ئازادو ڕووت کراوە لەو هەموو کاریگەرە دەرەکی و ناوەکی و دیراسەو پەروەردەو کۆمەڵگاو دەورووبەرو ، ئەو داب و نەریتانەی تیایدا ڕەگیان داکوتاوە ، بووە بە شتێکی مەحاڵ و بەڵگەنەویست بۆ ڕاستەقینەی شت و واقیعی ڕاست و ڕەوان و ، بڕیاردەرکردنی بێ خەوش و دڵسۆزانە ، کارێکی نەشازەو ، نەشازیش هەروەکو نەبوو وایە و متمانەی ناخرێتە سەر لە بەڵگە هێنانەوەیدا ئەم لێکۆڵینەوەی وردەی ئیمام نهێنی یەکەی دەرخست و لە نامەکانیدا زۆر تیشکی دەخستە سەرو بەچەند جارو چەند بارە دەی وتەوە ، تەنها دۆزینەوەیەکی نوێی سەردەم و دەورووبەرەکەی نەبوو ، بەڵکو ڕوون کردنەوەیەکی زۆر مەزن بوو لە ناوەندی جیهانە فیکریەکان و لێکۆڵینەوە زانستی یەکان و ، ڕاگەیاندنێکی نوێکاری بەجەرگانە بوو ، کە تاکو ئێستاش مافی خۆی نەدراوەتێ و نرخ و بایەخی نەزانراوە ، کەچی لەگەڵ ئەم نرخ نەزانینەی حەقی ئەوەی هەیە بکرێتە بابەتێکی سەربەخۆی لێکۆڵینەوەو وردبوونەوەو ڕاڤەو باسکردن(١) .

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو .

جـا ئەوەی لێرەدا زۆر گرنگەو جێی سەر سوڕمانە ئەوەیە ، فەیلەسوفی ئەڵمانی بەناوبانگ ( ئەمانوئیل کانت ١٧٢٤ - ١٨٠٤ )نزیکەی دوو سەدە پاش ئیمامی سەرهەندی دەستی کرده باسێکی مـەوزوعیو لێکۆڵینەوەی زانستیانە دەربارەی توانای ڕووت بوونەوەو ئازاد بوونی عەقڵ لـە دەست کاریگەرەکانی دەوروبەرو هۆکارەکانی بۆماوەو دابو نەریتو حوکم دانی تەواوو ڕاستو ڕەوان لە هەر مەسەلەیەکدا بێت .. هـەتا بە دیاری کردنی سنورو جغزی عەقڵ بـەو پەڕی ئازادییو لێ هاتوویی و بلیمەتانەوە ، لەو بابەتەوە کتێبە بەنرخەکەی ( نقـد العقـل الخالص )ی لەساڵی ١٧٨١ز بڵاو کردەوە ، شڵەقاندنو شێواندنێکی وای لە ناوەندە فیکریو فەلسەفیەکاندا دروست کردو وای هەژانـدن ، کـە هەموو بیروڕا کۆنەکانی سەر بەو بابەتەی ڕوخاند ، وەکو دکتۆر ئیقبـال دەڵێت : ( کانت کاری هەموو موتەنەویرەکانی ( المتورين ) ڕوخـاندو ، کردی بە مشتێك خۆڵ )(١) .

وڵاتانی ڕۆژئاوا هەموویان پشتی ئەم کارەیان گرتەو ، دانیـان نا بە نرخی زانستیو مەزنێتی ئەم کتێبە لە بواری دیراساتدا بە چـەشنێك کە شیاوی (کانت) بێت ، تا ئەو ڕادەیەی زۆر جار وتویانە (ئەم بەرهەمە فیکریە ، خەڵاتێکی خوایی مەزنە بۆ گەلی ئەڵمانی ) ..

( ئەمانوئیل کانت ) دەڵێ : فیکر بە پڕوپاگەندە دەست بەکـاری خۆی دەکات بێ ئەوەی هەست بە خۆی بـکاتو زۆر جار لەبەر ساکاری پشت بە ڕاستێتی پێشەکیو ، گریمانکاریو ، توانستەکانی دەبەستێت ، بە خەیاڵی خۆی وا دەزانێت بەوپەڕی متمانەو یەقینەوە کـە دەتوانێ هەموو

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو

مەسەلەیەك حەل بکات‌و دەگاتە چیەتی‌و نهێنی‌یەکانی بوونەوەر ، کەچی سەردەمێکی تر دێت بۆی دەردەکەوێت ئەو بڕیارە عەقلی‌و فیکریانەی لەوەو پێش دایڕشتبو تا هەوری ئاسمان ناڕوات‌و ناگاتە ئەستێرەکانیش ، ئیتر لێرەوە گومان دوو دلی پەیدا دەبێت ، ئەوجا دەزانێت شتێك هەیە وازی لێ هێنراوەو هەموو یەکێك لە بڕو باگەندەکاران‌و گومانداران چاویان لێ پۆشیوە ، ئەویش ئەوەیە کە پێویستە لە عەقل‌و ئیدراکمان بکۆڵینەوەو ، چیەتی‌و جۆرێتی زانیاریمان بزانین‌و ، پێویستە جۆری ئەو وێنەو هێزانەی هەمانە بۆ تێگەیشتن‌و زانین بەکاریان دێنین ئاشکرا بکەین ، بزانین تا چ ڕادەیەك دەتوانین لەبەر ڕۆشنایدا ڕێ بکەین ) .

بەڵێ ئەوەی ئیمامی سەرهەندی لە پێش دوو سەد ساڵ لەمەو بەر دەری خستووە و ڕوونی کردۆتەوە تازە فەلسەفە لەسەر دەستی کانت دەیسکاتێ‌و بەنەواوەتی دەیسەلمێنێ کە عەقلی ڕووت‌و بێ گەرد بەتەنها خۆی نیەو دەست ناکەوێت چونکە کاتێ عەقل بیر کردنەوە بەرهەم دەهێنێت کە لەگەڵ ئادەمیزاد تێکەڵاو بێت ، ئەو ئادەمیزادەی لە جەستەو ڕۆح پێك هاتووە جا ئیتر کەوابوو چۆن دەتوانین عەقل لەم هەموو ئاڵۆزکاوی‌یەی ڕۆح‌و جەستە بە هەموو بەشەکانیەوە داڕنین‌و ئەمجا پشتی پێ ببەستین ، ئەو عەقلە عەقڵێکی زیندوو نیە ، بۆ نموونە بۆ ناسینی خانەی زیندوو ناتوانین خانەکە لە لەش جیا بکەینەوەو ئەمجا بیناسین چونکە کە خانە لە لەش جیابۆوە دەمرێ ، ئیتر جیاوازیەکی زۆر هەیە لە نێوان پشکنینی خانەی زیندوو ، خانەی مردوو ، ئیتر کە عەقل لە ئادەمیزاد جیاکرایەوە لە ڕاستیدا ئەو عەقلە مردووە نەك زیندوو .

پرسیارێك دەکرێت : عەقل سەرەڕای ئەوەی کە خۆی کۆڵەوارو

پەك کەوتووە دەربارەی ئەحکامەکانی خوایەتی ، بەڵام ئەگەر هاتوو لە ئەنجامی خاوێنی دەروونو درەوشانەوەی ڕۆحی لە نێوان ئەوو زاتی خوادا پەیوەندیەکی تایبەتی دروست بوو ، پەیوەندیەکی وای نەگۆڕ بێت کە بتوانێ بە هۆیەوە ڕاستەوخۆ لە حەزرەتی قودسیەتەوە شت وەربگرێتو ، پێویستی بە ناردنێك نەبێت لە ڕێی پێغەمبەرانەوە دەستی بکەوێت ، ئایا ئەوکاتە ڕاتان چۆنە ؟ ئیمام لە وەڵامدا دەڵێت :

هەرچەندە عەقڵ خۆی نزیك بکاتەوەو ، لەگەڵ خوادا پەیوەندی پەیدابکات ، ناتوانێ پەیوەندی لە جەستەی توخمداردا بە هیچ شێوەیەك بپچڕێت ، ڕووت بوونەوەی تەواو و ئازادی ڕەهای هەرگیز دەست ناکەوێت ، هێزی وەهمو خەیاڵ هەمیشە جڵەوی دەگرنو ، هێزی توڕەیی‌و ئارەزووەکانی هەروەکو سێبەری خۆی لەگەڵیدا دەبنو ، سیفاتی سوربوونو تەماعکاری خراپ دروشمی دەبنو ، لە بیرچونو لێ‌تێك چوون دایم بە مرۆڤەوە بەندنو وازی لێ‌ناهێنن ، هەڵەکردنو تاوان کردن سیفاتی مرۆڤنو لاناچن ، کەواتە عەقڵ شایستەی متمانەو پشت پێ‌بەستن نیە ، چونکە بڕیارو ئەنجامەکانی لە کۆنی وەهمو گۆڕینو خەیاڵ ڕزگاری نەبووە ، لە تێکەڵاوکردنو لێ‌تێك چونو لەبیرچونو هەڵەکردن نەپارێزراوە ، بە پێچەوانەی مەلائیکەتەوە کە لە هەموو ئەم سیفەتانەوە خاوێن کراونەتەوەو ، دوورن لەم هەموو عەیبو کەمو کوڕیانە ، لەبەر ئەوەیە هیچ چارەیەك نیە هەر ئەوانن شایستەی متمانەو پشت‌پێ‌بەستن ، چونکە لە وەهمو خەیاڵو لێ تێك‌چوونو هەڵەو لەبیر چوونەوە پارێزراون ... هەندێ جار وادێت بە خەیاڵدا کە ئەو زانیاریانەی دەستی مرۆڤ کەوتووە لە ڕێگای ڕۆحی‌یەوە بە بێ ئەوەی هەست بکرێت لەکاتی بەجێ‌هێنانی‌دا تێکەڵاوی هێزو هەستیارەکان بووە

ـ كه خۆی له خۆیدا پێشەكی بە كەجی لای ئەو بووه بە شتێكی چەسپاو جا بۆیە ڕاست نیە ، بەڵكو لە ڕێگای وەهم و خەیاڵەوە هاتۆتە كایەوەو بە ڕادەیەك ناتوانی جیاوازی لە نێوان ڕاستیو وەهمو خەیاڵ بكات ، جاری واش هەیە دەتوانێ جیاوازی بكات لە نێوانیانداو جاری واش هەیە ناتوانێ . گومانیش لەوەدا نیە كە ئەم زانیاریانە لە ئەنجامی تێكەڵاو بوونی بەم پێشەكیانە هەروا بە جێگای گومانو دوو دڵی دەمێنێتەوە ، ڕاستی تێدا نایەتە دیو ، ناكونجێ متمانەی پێ بكرێتو بەنای بۆ برێ )[1] .

(١) الرسالة رقم ٣٦٦ هەمان سەرچاوەی پێشوو .

## پێناسەی عەقل :

مادام ئێمە باسی عەقڵمان کردو تواناو سنوریمان دیاری کرد پێویستە عەقل بناسین‌و بزانین چی‌یە ؟ پێناسەی عەقل زۆرەو بۆچونی زانایانیش لە بارەیەوە جیاوازە لەوانەیشە لە مەبەست‌و مانادا هەریەك شت بگرێتەوە هۆیەکەشی لەوەدایە چونکە عەقل شتێکی مادی‌و بەرجەستە نیە ئەوا هەرکەسە چۆن هەستی پێ بکات بەو شێوەیە دەیناسێنێ . بەڵام لە لای هەمرویاندا هەمان مەبەست دەگەیێنێ کە ئێستا دەیڵێین : ( عەقل هێزێکی مودریکە لە مرۆڤدا ، دیاردەیەکە لە دیاردەکانی ڕۆح ، جێگاکەیشی مێشکە ، هەروەکو چۆن بینین تایبەتێکە لە تایبەتیەکانی ڕۆح بەڵام ئامێرەکەی چاوە ، عەقل دوو عەقڵە ، عەقڵێك خوای گەورە خۆی دروستی کردووەو ئەویش ئەسڵە ، عەقڵێکیش ئەوەیە کە خەڵکی لە ئەزمونی ڕۆژانەی ژیان دەستی دەکەوێت ئەگەر هەردوکیان کۆبونەوە ئەوا یەکتر بەهێز دەکەن هەروەکو ئیمامی عەلی ( خوا لێی ڕازی بێت ) دەفەرموێ[1] :

دیتم عەقل دوانە سروشتی‌یەو بیستراو
سروشتی تێدا نەبێت کەڵکی نیە بیستراو
هەروەکو خۆر کەڵکی نیە کە نەبێت ڕوناکی چاو

---

(۱) مجلة آفاق عربية ـ السنة الحادية عشرة ١٩٨٦ .

کەواتە عەقڵ هێزێکەو سودی لێوەر دەگیرێت بۆ ڕووناك کردنەوەی ڕێگای ژیانو زانینی نەزانراوەکان لە ڕێی زانراوەکانەوە. جا لەو کەسانەی ڕێگەی عەقڵ دەگرنە بەر لە ژیانیانداو دەیانەوێ بگەنە ئامانج زۆربەی کات سەرکەوتوون چونکە عاقڵەتە لە کاتی هەنگاونانیدا دەبێ هەنگاوی دووەمی تەواوکەری هەنگاوی پێشووی بێتو ئامادەکەریش بێت بۆ ئەوەی بۆی دەڕوا بە ڕادەیەك ئەو هەنگاوانەی دەینێت بە چەشنێکی وا یەك دەگرنو ڕێلێو پێك دەبن کە بێتە هۆیەك بۆ گەیشتنە ئەو ئامانجەی مەبەستیەتی ، جا لێرەشدا هیچ جیاوازیەك نیە ئەگەر ئەو ڕۆیشتنە هەر دوو پێیەکانی بێت بەسەر زەویدا بڕوات تا دەگاتە ئەو جێگایەی دەیەوێت ، یاخود ڕۆیشتنەکە ڕۆشتێکی عەقلی بێت خاوەنەکەی لە فیکرەیەکەوە بگوێزێتەوە بۆ فیکرەیەکی تر تا دەگاتە چارەسەر کردنی ئەو گیروگرفتەی دەیەوێت چارەی بکات ، ئا ئەمەیە ڕۆیشتنی عەقڵیو ڕوخسارە دیارەکەی بەلام ڕێگای عاتیفە یان غەیری عەقلی بریتیە لەوەی کە خاوەنەکەی ڕێگایەك کە خۆشی دەوێتو بە ئارەزوویەتی هەڵی دەبژێرێت بە چاوپۆشین لەو ئەنجامانەی دەیگاتێو لێوەی پەیدا دەبێ[1] .

ئەگەر لەم ڕوانگەی عەقلیەوە بڕوانینە ژیانو سەردەمی ئیمام دەزانین ڕێگاکەی کە ئیمام گرتی یە بەر ، ڕێگایەکی عەقلی بوو بە هەردوو چەشنەکەیەوە بەسەر زەویدا هەنگاوێکی ئاقلانەی نا تا گەیشتە کۆشکی پاشایەتیو جڵەوی گرتن بەرەو ئاین ، وە ڕێگایەکی عەقلی فیکری گرتەبەر بۆ بوجەڵ کردنەوەی پایە خراپەکانی

(١) المعقول واللامعقول ـ دکتور زکي نجیب محمود .

فەلسەفەو ئیشراقیەکان .. جا لە ئەنجامی چڕبوونەوەی عەقڵ بەرامبەر بە ڕوداوو بەسەرهاتو گیروگرفت پێوانەیەك دێتە کایەوە پێی دەڵێن حیکمەت ـ پەندیاری ـ هەرچەندە ئەو پەندیاریە لە ئەنجامی چەند گیروگرفتو ڕووداوی سەردەمێکدا پەیدا بووەو پەیوەست بووە بەو کاتەوە ، بەڵام ئەگەر هاتو داتڕنی لەو ڕووداوو گیروگرفتانەی ئەو سەردەمە ئەوا دەبێتە پێوانەیەك بۆ هەموو سەردەمو کاتێك ، سوودی لێ وەربگیرێت .

## پیاوانی ئیشراقو دەروون ڕووناك :

( لـە دێر زەمانەوە ئەو بڕیارەی دراوە کە ئیشراقو ڕووناکی دەروونو ڕۆح ، هۆیەکی پاکو بێگەردو دوور لە گوناهە بۆ گەیشتن بـــە یەقینو زانستی ڕاستو ، چاکردنی ڕەوشتو خاوێنکردنەوەی دەروونەکانو دروستکردنی کۆمەڵـگایەکی مرۆڤانە ‎•• میـــــرو هیندستان هەر لە چاخە کۆنەکانەوە مەڵبەندی ئەم بزوتنەوەیە بوون ، ئەوەی یارمـەتی بڵاوبوونەوەی ئەم بزوتنەوەیەی داو ، بەهێزی کـرد تا لای خەڵـکی پەسەند بکرێ ، ئەو بەرتەکدانەوە بە توندە بوو لە ناو ڕۆمـاو یۆناندا سەری هەڵدا بۆ بەرگری کردنی ئەو زیادە ڕەویو زۆر ڕۆدا چوونە بوو بەرامبەر بە پیرۆزگرتنی عەقڵ دەکرا لە لایەکەوەو ، ئەو پەرستە شێتانەیەی هەستیارەکان بوو لە لایەکی ترەوە ‎•• لـــە ئەنجامدا لە ئەسکەندەریە مەڵبەندی داکوتا ، کە جێی بەیەك گەیشتنی عەقڵو ئاینە ڕۆژئاواییو ڕۆژهەڵاتیەکان بوو )[1] •

پشتگیرانو لایەنگیرانی ئەم فەلسەفەو بزوتنەوەیەو شوێنکەوتوانی دەڵێن : بەهێزترین هۆ بۆ دەستخستنی ئەو یەقینو زانینە ڕاستەی کـــە بریتی بێ لە دیتن بە چاو ، بە خـــاوێنی نەفسو ، نوری دەروونو ، ورپاکردنەوەی هەستە دەروونیەکان نەبێت دەست ناکەوێت ، بـە هیــچ

---

(١) رجال الفكر والدعوة / ابو الحسن الندوي •

جۆرێك لە تواناندا نیە گەیشتن‌و بەو ڕاستی‌یانە تەنها بە هـــۆی ئـەو عەقڵە بێ‌گەردو بێ خەوشەوە نەبێت ئەویش حیکمەتی ئیشراق‌و نوری دەروونی‌یەو بە ریازەت کێشان‌و بەربەرەکانی نەفس‌و ئارەزووەکانو بیرکردنەوەو ، چاودێری کردن پەیدا دەبێت .

جا ئەگـەر ئەم داوایەمان سەلماند ، دەگەینە ئەوەی کـــە دەبێت هەستی شەشەمی ( دەروون )ی هەبێت‌و کاری خۆی لە مرۆڤدا دەکات ، جگە لە پێنج هەستیارە ناسراوەکان . لـەم ئەنجامەدا شتی وا دەبینێت‌و دەبیستێت بە هۆی (مشاهدات)ەوە کـە بۆ مرۆڤ ئاشکرا دەبێت لـەوەو پێش نەزانرا بوو ، بەڵام ئایا بەڵـگە چی‌یە ئەم هەستەش سنووردار نیەو، شیاوی هەڵەو گوناه کردن نیە وەکو هەستیارەکانی تر ؟ جا ئەگـەر وا بوایە ئەوە هیچ دژواری‌و بەربەرچدانەوەیەکی تێـــدا نەدەبو ، بەڵام مێژووی ئەم ئیشراقە دەمانگەیەنێتە ئەوەی ئەو ئەنجامو بیروڕایانەی دەیگاتی هەمیشە تووشی جیاوازی‌و بەربەرچدانەوە بووە ، هەروەکو چۆن ئـــەم دژواری‌و جیاوازی‌و بەربەرچدانەوەیە ڕووی کردۆتە دەرئەنجامەکانی فەلسەفەی یۆنانی‌و عاقڵمەندانی ڕۆژهەڵات .

بۆ نمونە : فلاتینس باوەڕی بە نیزامی ئاینی‌و ئەو پەرستە باوەی سەردەمی خۆی نەبوو ، لەگـەڵ ئەوەشدا کە فەیلەسوفێکی سەربەستی بێ کۆت‌و زنجیر بوو ، هەمیشە تەرکیزی لەسەر چاودێری کردنو بیرکردنەوە بوو وەك لە پێش‌کردن ، بەڵام قوتابیە پاوچاك‌و ماقوڵەکەی بە ناوی (پارفری) سۆفیەکی زاهیدی کـــەم خواردە بوو ، فلاتینس باوەڕی هەبوو بە کلێشە گۆڕی ( تناسخ الارواح )[1]و دەرکـــەوتی

---

(١) فەرهەنگی پەروەردەو زانست ـ ژمارە (١٤)ی ١٩٧٨

ڕۆحی ئادەمیزاد جارێکی تر لە دەروونی تازەلدا ، بەلام بارفــری باوەڕی بەمانە نەبوو ، پێشەوای سێ‌یەمی ئەم سێ قوتابخانەیە ( بر اکلس ) بوو کــە پەیڕەوی هــەموو جەشنە دابو نەریتو دروشــمەکانی میسری دەکرد ، ڕۆژی سێ جار خۆری دەپەرست ، مەزهەبەکەی لـــە زۆر عەقیدەو ئاینی جیا جیا تێکەلاو بوو ، ئەمانە هەموویان خــاوەن بینینو بەقین بوون .

بارفری دژی مەسیحیەت وەستاو پشتی قەیسەری ڕۆمی گرت لــە بزوتنەوەکەیدا ، بۆ زیندوکردنەوەی بتپەرستیو نەفامی ڕۆمی نوێ کەچی ، لە کاتێکدا کە خۆی بە کەشتی بتپەرستی‌یەوە بەستەوە .

هەروەها خاوەن کەشفو ئیشراقیە موسلمانەکان کـــە هەمیشـــە متمانەیان دەخستە ســەر ئەم دوو هێزە ، کەچی لە کەشفو هەستەکانی دەروونیان جیاوازیو دژواریەکی زۆر دەبینەوە هەریەکەیان بەرپەرچی ئەویتریان دەداتەوە ، وای دەسەلمێنێت کە کەشفی ئەویتریان دوورە لــە ڕاستی‌یەوەو لەگەل واقیعدا ناگونجێ .

یەکێك لــەو ئیشراقیانە ( شهاب الدین السهروردي ) یە کـــە بە ( المقتول ) ناوبانــگی دەرکردووە ، بەفەرمانی ( ملك الظاهر ) ســـالی ٥٨٧ی‌ك دەکوژرێ ، سەرموەردی خۆی دەلێ ڕێبازەکەی لە هـــەر دوو فـــەلسەفەی زەوقی ( الاشـراقي )و فەلسەفەی گەڕۆکـــایەتی (المشائیة)[١] کۆی کردۆتەوە . گرنگترین کتێبی کە دایناوە ( حکمة

---

(١) (المشائیة) فەلسەفەکەی ئەرستۆیە ، بۆیە ئەم ناوەیان لێناوە جونکە فەلسەفەکەی بەسەر پێ‌یەوە لەڕارەوێکدا دەگەیاند ـ المنجد الطبعة الرابعة والعشرون .

الاشراق)ەو ، (قطب الدین الشیرازی) ڕاڤەی کردووە •

شێخی ئیشراقیەکان ( سەهرەوەردی ) دەڵێ عەقڵەکان بە تەنها لەدە عەقڵدا کۆبونەتەوە ، بەڵکو هەموو جۆرە شتێك لەم بونەوەرەدا عەقڵێکی تایبەتی خۆی هەیە ، وای لێك دەداتەوە ( کە ئاسمان مەخلوقێکی زیندووەو خاوەنی نەفسە ، ئەو دەڵێ گەورەترین ئەستێرە خۆرە پێویستە لەسەر خاوەن ئیشراقیەکان بە مەزنی سەیری بکەن‌و ڕێزی لێبگرن ، تا لەم قسە سەیر سەیرانە شتی تری زۆر وتووە • • لێرەدا بۆمان دەرکەوت ئەم حەکیمە ئیشراقیە مەزنە پێگەیشتووەی سەردەمی خۆی‌و نازناوی ( شیخ الاشراق)ی بۆ بەخشرا نەیتوانی لەم خەیاڵ‌و وەهمە سەرسوڕهێنەرانە ڕزگاری بێت ، هەروا بە بێ بەشی مایەوە لە نیعمەتی پێغەمبەرێتی محمد صلی الله علیە وسلم هەتاوەکو دەمرێ )[1] •

---

(١) رجال الفكر والدعوة ـ ابو الحسن الندوي

## عەقڵ و کەشف سواربووی کەشتی یەکن[1] :

ئەمانوئیل کانت[2] ، بێ گومان دوو دڵی یەکی زۆری بەرامبەر بە ڕووت بوونەوەو پوختەیی عەقڵ هەژاند ، بڕیاری ئەوەی دا کە پاک بوونەوەو خاوێنی و ئازاد بوونی عەقڵ لە کاریگەرێتی دەرەکی و ناوەکی نیمچە مەحاڵێکە ، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم پیاوە پیاوێکی فەلسەفی یەو ، هیچ پەیوەندیەکی بە کەشف و عیلمی دەروونی یەوە نیە نەیتوانیوە لەوە زیاتر هەنگاوێکی تر بنێ بەڵام ئیمامی سەرهەندی لەبەر ئەوەی ڕۆچووی ئەم دەریا مەزنەیەو ، هەنگاوی تری ناوەو باسەکانی بابەتی کەشف و ئیلهامی خالصیشی گرتۆتەوە ، بەدەست هێنانی ئەم دوانە بەدرێژی و ڕاڤەکردنەوە زۆر دەگمەنە ، ئەو بڕیارەی دا کە ئیشراق و دەروون خاوێنی بە تەنها بەس نین بۆگەیشتن بە ڕاستی یەکانی غەیب . جا ئەو زانیاریانەی کە هیچ جۆرە گومانێکی تێدا نەمێنێت و خەڵکی و

---

(۱) هەمان سەرچاوەی پێشوو .

(۲) ساڵی ۱۷۲٤ز لە ( کانیزبورغ )ی سەر بە بروسیای ڕۆژهەڵاتی هاتۆتە دونیاوەو لە خێزانێکی هەژار بووە ، زۆر بابەتو لێکۆڵینەوەی لە پاش خۆی بەجێ هێشتووە دەربارەی ئەستێرەناسی و فیزیاو فەلسەفەو مەنتق و پەروەردە ـ اعلام التربية

نایبەتمەندانیش نەتوانن بەدەستی بهێنن تەنها رێبـــازی پێغەمبـــەرانو
پەیامەکەیانە ، گەیشتن بەزانینی تەولو و ، رزگاربوون لــە دۆزەخو
خاوێن بوونەوەی راستەقینە تەنها لە رێی باوەرهێنان بە پێغەمبەرێتییانو
شوێن کەوتنی پەیامەکەیانەوەیە .

لــە یەکێك لە نامەکانیـــدا دەڵێ :

ئـــەم فەیلەسوفانەی رێــگای ریازەت کێشانو موجاهـــەداتیان
گرتەبەر ، ـ رێــگای ئەو سۆفیە رەبانیانەی کــە شوێنی پێغەمبـــەر
کەوتبوون ـ بەڵام ئەمان متمانەیان دەخستە سەر تەصەوراتو دیتەکانیانو
کەشفو بینینیەکانیان دەکردە پێشەنــگی خۆیان ، بۆیە گومرا بوونو
خەڵکی تریشیان گومراکرد ، چونــکە ئەوانە ئاگایان لەوە نیـــە کــە
دەروون سافی گومرایان دەکاتو ســـەریان لێ تێك دەدات وەکـــو دڵ
روونی نیە کە دەروونەیەکە بۆ رێی هیدایەتو رووناکی ، چونکە دڵ
روونی بە پێغەمبەرانەوە بەستراوە ، دەروون خاوێن کردنەوەش بــە دڵ
روونیەوە بەستراوەتەوە ، ئەویش بە مەرجی پەروەردەکردنی دەروونو
چاکردنەوەی ، چونــکە رووني دەروون لەگەڵ تاریکی دڵ(١) ـ کـــە
ئاوێنەی نورەکانی خوایەو تیایدا دەدرەوشێتەوە ـ وەکو چرایەك وایـــە
دادەگیرسێنرێت تاوەکو دوژمنە نادیارەکە ( شەیتانی لەعین ) لـــەبەر
تیشکەکەیدا ئەو خانووە لە بناغەوە بروخێنێت تاوەکو بە تەواوەتی بیــکات

---

(١) پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت ( قلب المؤمـــن عرش الرحمن ) یان ئـــەو حەدیسە قودسیەی دەفەرموێ ( ان السموات والارض ضعفت عن ان تسعني ووسعني قلب المؤمن ) رواه احمـــد عن وهب بن منبه / الاتحافات السنية بالاحاديث القدسية . تاليف عبدالرؤف المناوي .

بە وێرانەیەکی کۆچ کردوو .

لێرەدا دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە ڕێگای موجاهەدات و ڕیازەت کێشان لە ڕێی بەڵکە هێنانەوەی نەزەری هیچ جۆرە یەقینی و دڵ ئارامیەك نابەخشێت ، وەکو شێخی سەعدی دەفەرموێت :

( ئەی سەعدی مەحاڵە بتوانی ڕێگەی چاکە خوازی و دڵو دەروون خاوێنی بگریتە بەر ئەگەر لە ڕێی شەریعەتەکەی (مصطفی)وە صلی الله علیه وسلم نەبێت )[1] .

## تێکەڵ کردن لە کەشفدا :ـ

( دەبێ ئەوە بزانین ، کە هەڵەکردن لە کەشفدا هەر لە ڕێگای ئیلهام و وەسوەسەی شەیتانیەوە پەیدا نابێت ، بەڵکو زۆر جار ئەحکام و ڕووداوی وا دەنیشێت لە خەیاڵی ئەو خاوەن کەشفانەدا کە هیچ پەیوەندیەکی بە ڕاستی و واقیعەوە نیەو ، دەستی شەیتانی تێدا نیە ، ئەمجا ئەم خەیاڵ و تەصەوراتانە لە دەرەوەیاندا خۆی دەنوێنێ ، هۆیەکەی ئەوەیە هەندێ کەس لە خەونیاندا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەبینن و ئەحکامی وای لێ وەردەگرن کە پێچەوانەی ئەحکامەکانی شەریعەتەو لەگەڵ فەرموودە صەحیحەکاندا ناگونجێ ، ئەمەش هەرگیز ناگونجێ لە شەیتان و وەسوەسەی شەیتانەوە بێت ـ چونکە شەیتان ناتوانێ خۆی بە پێغەمبەر بگۆڕێت ـ کەواتە ئەمانە هەمووی هەر هێزی خەیاڵە ئەم جۆرە خەیاڵ و وێنانە دەگرێت کە دوورە لە جیهانی واقیعەوە .

(١) الرسالة رقم ٢٣ / المجموعة الثالثة .

لە یەکێك لە نامەکانی تریدا دەڵێ : ( نەفس هەرچەندە بە خـاوێن کردنەوەو پاك کردنەوەی بـگاتە نەفسی (مطمئنە) ناتوانێ بە هیچ جۆرێك بە تەواوەتی لە سیفاتەو ڕەوشتەکانی ڕووت بێتەوە ، بۆیە دەگونجێ تاوان خۆی بکوتێتە ناخیەوەو بکەوێتە هەڵەوە )[1] .

---

(1) هەمان سەرچاوەی پێشوو .

# پێغەمبەرانو فەیلەسوفان

ئەم فەیلەسوفانە بە نرخترینو بەهاترین تەمەنی خۆیان بەکار هێنـ
بۆ ئەوەی ئامێرێ بە دەست بهێنن تا لە هەڵەی فیکرىو هەڵخلیسکاندنی
عەقڵی بەدوور بن ، بە لێکۆڵینەوەو توێژینەوەو وردبوونەوەی لەم پێناوەدا
زۆر ماندوو بوون ، کاتێ کـە گەیشتە ئەوەی لــە زاتی خــوداو
سیفەتەکانی بکۆڵنەوە کـە مەترسیترینو مەزنترین بابەتە لە لێکۆڵینەوەدا،
هێزیان لێبڕاو خاوبوونەوەو ئەمجا ئەو ئامێرەی لــە هەڵەی فیـکری
دەیپاراستن ، خستیانە لاوەو دەستیان کردە بێ هەڵتوتانو وڕێنەکردنو ،
سەر لێشێوانو سەرگەردانی ڕووی تێکردنو لە ناو تاریــکی نەزانیــدا
دەتلانەوە هەروەك کەسێك چەندین ساڵی تەمەنی خەریك کردبێت بــە
کۆکردنەوەی چەكو تفاقی جەنگ ، بەڵام ئەو ڕۆژەی جەنگ دەرکەوت،
لاوازیو بێهێزی هەموو ئەندامەکانی لەشی ئەو کەســە بگرێتەوەو
ئەمجا خاوبێتەوەو ئەو چەكو تفاقانەی هەموو لە دەست بەربێتەوە .

جا هەندێ لەو کەسانەی کە خەریــکی فەلسەفەن ، زۆر جــار بە
هەڵەدا دەچنو دەگەنە ئەو بڕوەیەی کە فەیلەسوفەکان دەگەنە پلــەی
پێغەمبەران ، بەڵــکو دەگەنە ڕادەیەك کە دەیانەوێ ئەو زاتیارانەی ئەوان

فەزڵ بدەن بەسەر شەریعەتی پێغەمبەران ، بەڵێ ئەوان باوەڕیان وایە کە ئەم فەیلەسوفانە حەکیمن ، بۆیە زانیاریەکەشیان ناو ناوە حیکمەت ، کەچی ئەمانە دەبنە نێچیری گیروگرفتو ئاڵۆزان ، چونکە حیکمەت بریتی‌یە لە زانینی شتێك هەروەکو چۆن لە واقیعدا هەیە[1] ، بەڵێ ئەو زانیاریانەی پێچەوانەی زانیاری حیکمەت بێت وەکو ( شەریعەتی پێغەمبەران ) ئەوە لە لای ئەو حەکیمانە پێچەوانەی واقیعو ڕاستی‌یە)[2].

هەروەها دەربارەی خۆپاکردنەوەی تەواو دەڵێ

• ئیمە دەڵێین خۆپاکردنەوەو خۆچاك کردن بەستراونەتەوە بە کردەوەی جوانو چاك ، کە خوای گەورە ڕازی بکاتو وەری بگرێت، وە ئەم ڕێگایەش ناناسرێت تەنها لە ڕێگەی پێغەمبەرانەوە نەبێت ، نە خۆپاکردنەوەو نە خۆچاکردن بەبێ ناردنی پێغەمبەران بەدی نایێت •

بەڵێ عەقڵ بەڵگەیە ، بەڵام بەڵگەیەکی تەواو نیە ناگاتە پلەی کارتێکردنی تەواوو ڕوون کردنەوەیەکی بێ لیخن ، بەڵکو بەڵگەی تەواوو بێ چەنو چوون بریتی‌یە لە ناردنی پێغەمبەرانو نێررانو کە سزاو پاداشتی ئەمرو هەمیشەیی بەوانەوە بەستراوەتەوە[1] •

---

(١) ئەوەی ئاشکرایە کە زانست (العلم) شوێنی زانراو ( المعلوم ) دەکەوێت نەك بە پێچەوانەوە ، زانست وەکو زانراوەیەك بریتی‌یە لە شێوەی شتێك لە زەیندا بەڵام زانراو ئەو شتەیە لە دەرەوەدا بوونی هەیە • لە پێشەوە باسمان کرد فەلسەفەو مەنتیق پەنا دەباتە بەر زانراو بۆ گەیشتن بە نەزانراو ، زانستی پێغەمبەران چونکە لە فەرهەنگی ئەواندا نیە بۆیەو لەبەر ئەوەیە لێیان تێك دەچێت • ما القدر ؟ تالیف محمد قرقنجی • ترجمة محمد عونی •

(٢) الرسالة رقم ٣٣ / الإمام السرهندي / ابو الحسن الندوي •

(١) الامام السرهندي / ابو الحسن الندوي •

( له پێش هەموو شتێکدا پێویستە باوەڕ بەپێغەمبەر بێنین و پەیامەکەی بەڕاست بزانین تاوەکو بەم هۆیەوە لە تاریکیی و گومان و دوو دڵی ڕزگارمان بێت ، چونکە پێویستە لە پێشاندا لە بنەچە تێ بگەین و بیزانین ، ئەو کاتە تێ گەیشتن لە لک و هەندەکیەکان ئاسان دەبێت و چاك دەزانرێت ، چونکە زانینی هەموو لکەکان بە تەنها و بێ سەلماندن و ناسینی بنەچە ، کارێکی زۆر گرانە .. جا نزیکترین ڕێگا بۆ ئەم بەڕاستی زانینە بەتەواوەتیی و ئارامی دڵ و ئاسودەگی ، بریتی یە لە زیکری خوای گەورە ( ألا بذكر الله تطمئن القلوب ) زۆر دوورە لە گەیشتن بەم ئامانجە بەرزە لە ڕێگەی تێبینی کردن و وردبوونەوە و بەڵگە هێنانەوە :

هەروەکو ئەو شاعیرەی کە دەڵێ(١)

« خاوەن بەڵگەهێنەرەوان ـ فەیلەسوف و زیربێژان ـ پێیان لە تەختە دروستکراوە ، پێی تەختەش زۆر لاوازو کەم هێزە »(٢) .

**لە نامەیەکی تردا دەڵێ :**

« ئەوە بزانە هەر کەسێ شوێن پێغەمبەران بکەوێت و شوێن پێیان هەڵبگرێت ، پاش ئەوەی باوەڕی بە پێغەمبەریتیی یان هێناو پەیامەکەیانی بەڕاست زانی ئەوە لە یاوانی بەڵگەهێنەرەوان دەژمێررێت ، چونکە بەڕاستی زانینی ئەحکامەکانیان ـ بەبێ دەلیل ـ پاش باوەڕ هێنان

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو .

(٢) ئەو شاعیرە مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی یە دەقەکەی بەعەرەبی لە کتێبی ( مثنوي جلال الدين الرومي )دا دەڵێ « هؤلاء الاستدلاليين يسعون على ساق خشبية والساق الخشبية متعثرة واهية » . الجزء الاول / ترجمة ودراسة الدكتور محمد عبدالسلام كفافي .

بە پێغەمبەرێتی‌یان بە بەڵگەوە ـ ئەوە عەینی دەلیل‌و بەلگەداری‌یە ، بۆنموونە : ئەگەر یەکێك چەند بنەچەیەکی بە بەڵگەو سەلماندنەوە وەرگرت ، هەرچی لقێك لەو بنەچانەوە دەرچێت ئەوە خۆی لە خۆیدا بەلگەدارو سەلێنراوە ، ئەو کاتە ئەو کەسە لە پیاوانی بەڵگە هێنەرەوانە بۆ سەلماندنی ئەو لقانە بە گشتی »(۱) .

بەڵێ جیاوازیەکی زۆر هەیە لە نێوان ئەوەدا کە ئەوەی عەقڵ باوەڕی پێ نەبێت لەگەڵ ئەوەدا کە لە سەرووی قۆناغی عەقڵەوە بێت‌و عەقڵ پەی پێ نەبات : « نابێ کەس وا تێ بگات کە ڕێبازی پێغەمبەران دژی ڕێبازی عەقڵە ، نەخێر ! بەڵکو ڕێگای عەقل کە بریتی‌یە لە تێنی‌و بەڵگە هێنانەوە بەشوێن کەوتنی پێغەمبەران‌و شوێن پێ هەڵگرتنیان نەبێت ناتوانێ بگاتە ئەو مەبەستە بەرزەی کە ئامانجیەتی چونکە دژایەتی شتێکەو کوڵەواری‌و بێ توانایی شتێکی ترە ، دژایەتی باش توانایی‌و بەهێزی نەبێت تەصەور ناکرێت ) .

---

(۱) الرسالة رقم ٣٦ / رجال الفكر والدعوة .

## پایەی پێغەمبەرێتی :

هـــەروەکو چۆن پایەو مەنزڵی عەقڵ لە پاش مـەنزڵو قۆناغی هەستیارەکانەوەیە ، ئەوەی کە عەقڵ دەرکی پێ دەکات هەستیارەکان دەرکی پێ ناکەن ، هەر بەم چەشنە پایەو قۆناغی پێغەمبـــەرێتی لـــە سەرووی قۆناغو پلەی عەقڵەوەیە ئەوەی کە عەقڵ دەرکی پێ ناکات ، ئەوا لە ڕێـگەی پێغەمبەرێتیەوە دەرکی پێ دەکرێت ئەوەی دان نەنێت بە بوونی ڕێـگایەکی تر جگە لە ڕێـگەی عـــەقڵ بۆ بەدەستهێـــانی زانیاری ، ئەوە لە ڕاستیدا ئینکاری ڕێـگەی پێغەمبەرێتی دەکـــاتو بەربەرەکانی ڕێـگەی هیدایەتو ڕووناکی بەخشین دەکات(١) .

بەڵام لەو سەردەمەدا لە ناوەندی فەیلەسوفو موسڵمانە ئیشراقیەکان پایەو مەنزڵی پێغەمبەرێتی لە لایان نزم بوو بۆوەو بێ بایەخ بوو بوو . هۆیەکەشی ئەوە بوو خـــۆیان خەریك کرد بوو بە فەلسەفەی یۆنانیو حیکمەتی ئیشراقیو بە تەواوەتی لە ڕۆحی ئیسلامو قورئانو حەدیس دوور کەوتبوونەوە ، جگە لەوەش پێغەمبەرانیان بەلاوە بێ نرخ بوو بوو چونـکە وەکو مرۆڤێکی ئاسایی دەژیانو دەخەوتنو دەیان خـواردو

(١) الرسالة رقم ٢٣ / رجال الفكر والدعوة .

ژیان دەهێناو بە خەڵکیەوە خەریك دەبوونو پەیوەندیان بە خەڵکیەوە دەبەست تاوەکو پەیامەکەیان بگەیێننو پەروەردەیان بکەنو ڕێنمایـیان بکەن ، ئەمە وایان لێ دەکات کە هەر بە خەڵکیەوە خەریك بنو ، ئیتر نەتوانن بەلایەکی تردا ئاوڕ بدەنەوە •

ئەمە لێکدانەوەی ئەو فەیلەسوفو ئیشراقیانە بوو • بەڵام ئەمانە کە هەمیشە خەریکی فەلسەفەو ڕیازەت کێشان بوون ، هیچ جۆرە ئاگایەکیان لە زانستە ئاینی یەکان نەبوو ، بە تایبەتی زانیاری حەدیسی پیرۆز ڕۆژ تا ئێوارە هەر خەریکی گێڕانەوەی کەشفو کەرامـاتو میعراجی ئەولیاکانی پێشوو و ، ئیشراقیەکانی ئەم دوا دوایی یە بوون ، هەمیشە باس باسی کەمالاتی دەروونیو تەجریدو تەفریدو فەناو مەستی بوو[1] •• لەبەر ئەم هۆیانە بوو ، نەفسی ئەم فەیلەسوفو ئیشراقیـانە وای دەبردە دڵیانەوە ، کە پایەو مەنزڵی ویلایەت لە پلەو پایـەی پێغەمبەریتی بەرزترە ، جا ویلایەتیش بریتی یە لە تەواوی لێبڕان بۆ

---

(١) تەجرید یانی ڕوتانەوەو داماڵین ، شت پێوە نەهێشتن
تەفرید یانی بە تاك دانان ، بە تاك زانین •

تەجرید بریتی یە لەوەی بە هەموو جۆرێ پشت لە جیهانو هەرچی لە جیهاندایە هەڵ بکات ، لە کانگای دەروونەوە خۆی داماڵێ لە ویستو نەویستی ئەو حاڵو مەقامانەی کە هەیەتی ، نە داوای هی تر بکات لە لەوەی کە هەیە نا سوپاسی بکات •

تەفرید ئەوەتە وا لەگەڵی خوادا ، پەنای هەر بەخوایە ، پەرستنی هەر بۆخوایە •

بەڵام تەجریدو تەفرید لـە ڕوانگەی تەصەووفەوە قۆناغ یا چۆنیەتیێکن کە بەسەر ڕێبواری ڕێگەی تەصەووفدا دێن •

بۆ زیاتر ڕوون بوونەوەی ئەم زاراوانە ، بڕوانە کتێبی «تەصەووف چی یە ؟»ی ئەمین شێخ علاء الدین نەقشبەندی ، لاپەڕەی ٢٨٣ تا ٢٨٦

خواو ، دابڕان‌و گۆشه گیری له خه‌ڵکی .. کاری پێغه‌مبه‌ریتی بریتی‌یه له بانگه‌وازی‌و ڕاگه‌یاندن ، که به خه‌ڵکیه‌وه به‌ستراوه‌ته‌وه ، وملی ڕووی نه خوای په‌روه‌ردگاره‌و ، پێغه‌مبه‌ران ڕوویان له خه‌ڵکی‌یه .. کەواته ڕووکردنه خوای گه‌وره بێ‌گومان به‌رزتره‌و چاکتره وه‌ك ڕووکردنه خه‌ڵك .. جا هه‌ندێکیان تۆزێك وه‌رعیان بوو باشتر بوون‌و ده‌یان وت : نه‌خێر ویلایه‌ت به تێچکاری له سه‌رووی پێغه‌مبه‌ریتی‌یه‌وه نیه ، به‌ڵکو مه‌به‌ست له‌وه‌دایه که ویلایه‌تی پێغه‌مبه‌ر خۆی له پێغه‌مبه‌ریتی‌یه‌که‌ی به‌رزتره ، چونکه پێغه‌مبه‌ر له‌و کاته‌ی که به خواوه خه‌ریکه زۆر مه‌زنتره له‌و کاته‌ی که به خه‌ڵکی‌یه‌وه خه‌ریکه‌و په‌یام‌و بانگه‌وازیه‌که‌ی ده‌گه‌یێنێ .

لێره‌دا بۆمان ده‌رکه‌وت ئه‌و سه‌رده‌مه چۆن شێواوو په‌رته‌وازه بوو بوو ، ئه‌مه‌ش به‌هۆی دوور که‌وتنه‌وه‌یانه‌وه بوو له‌سه‌رچاوه ڕه‌سه‌نه‌که‌ی شه‌ریعه‌تی ئیسلام‌و پێغه‌مبه‌ریتی محمد صلی الله علیه وسلم له ڕاستیدا ئه‌مه مه‌ترسیه‌کی ترسناك بوو ، پێویست بوو له‌سه‌ر پیاوچاکان‌و نوێخوازان به ئه‌رکی سه‌ر شانیان هه‌ڵسن‌و به‌رگری ئه‌م ناڕه‌وایی‌یه بکه‌ن .

یه‌که‌م که‌س به‌رامبه‌ر به‌م گیروگرفته سه‌ری به‌رزکرده‌وه‌و به ده‌نگێکی نێزانه هاواری کردو زۆریش کاریگه‌ر بوو ، چونکه به به‌ڵگه‌و حوجه‌ی ته‌واو قسه‌کانی ده‌وڵه‌مه‌ند کرد بوو ، به شێوازێکی وا بانگه‌وازی ده‌کرد دڵ‌و ده‌روونی خه‌ڵکی بۆ ڕاده‌کێشاو ڕووناکی ده‌کرده‌وه ئه‌و زانایه‌ش زانای خوداناسی به‌ناوبانگ ئیمام ( شرف الدین محمد بن یحیی المنیري ٦٦١ - ٧٨٦ك) بوو ، له ناوه‌ڕاستی سه‌ده‌ی هه‌شته‌می کۆچی‌دا بوو به چه‌شنێکی زانستیانه‌و لێ هاتووانه به‌ربه‌رچی

ئەم مەترسی‌یەی دایەوەو توانی سەرکەوتن بە دەست بێنێت .

پاش ئیمامی منیری ، ئیمامی سەرهەندی پێکەیشتو نوێ‌کەرەوەی ئەم زانستە مەزنە بوو ، نوێنەری ئەم ڕێگە ڕاستە بوو ، بە تەواوەتی لە نامەکانیدا ئەوەی سەلماند کە تەنها پێغەمبەران نمونەی تەواوی دەستکردی خوان لە ڕووی ڕەوشتی‌و عەقلی‌و ڕۆحی‌و بیروباوەڕیەوە . جا پەیوەندی پێغەمبەران بە خوداوە هیچ شتێك ناتوانێ بەربەستی بکات لە نێوانیاندا ئەمەش بەهۆی فراوانی سنگیان‌و هەڵبژاردنیانەوە لە لایەن پەروەردگارەوەو تایبەتە بەخۆی . بەرزی هیمەتیان‌و هێزی ئارامگرتنیان‌و خۆڕاگرتنیان گەورەیی دڵ‌و دەرونیان‌و ، مەزنی ئەو کارەی پێیان سپێرراوە ، وایان لێ دەکات کە هەمیشە هوشیارو زرنگ بن ، چونکە پێغەمبەران لەو شوێنەوە دەست پێ دەکەن کە ویلایەت کۆتایی دێت‌و تەواوی‌و پلەو پایەی ویلایەت لە چاو پلەو پایەی پێغەمبەرێتی وەکو دڵۆپە ئاوێکە لە چاو دەریایەك .

بەڵێ پێغەمبەران ( درووودی خوایان لەسەر ) بەرزترین دروست‌کراون لە ناو بوونەوەرداو بەرێزترین سامان‌و بەهرەیان پێ بەخشراوە . ویلایەت هەندێکە لە پێغەمبەرێتی . پێغەمبەرێتی خۆی لە خۆیدا هەمەکی‌و گشتە ( کلّ ) گومان لەوەدا نیە کە پێغەمبەرێتی لە ویلایەت بەرزترە ، جا ئەگەر ئەو ویلایەتە هی پێغەمبەر بێت یان ویلایەتی وەلی بێت هیچ جیاوازیەکی تێدا نیە .. چونکە ئاگاداری‌و هوشیاری چاکترە لە مەستی ، مەستی لەناو ئاگاداری‌و وریایی دایەو تێدا پێچراوەتەوە . هەروەکو چۆن ویلایەت لە ناو پێغەمبەرێتیدا پێچراوەتەوە ، بەڵام ئەوەی لەناو خەڵکیدا هەیە لە ئاگایی‌و هۆشداری ، ئەمە بابەتی ئێمە نیە ، چونکە ئەو مەستی‌یەی کە فەزڵی دراوەتێ لە

چاو ئاگاداری خەڵکی بە گشتی ، هیچ ئیعتبارێکی بۆ دانانرێ .. بەڵام ئەو ئاگایی‌و هۆشیاریەی کە مەستی گرتۆتە خۆی بە بێ گومان لـــە مەستی چاکترە . زانیاریەکانی شەریعەت کە سەرچاوەو چاوگەکەی پێغەمبەرێتی‌یە ، هەمووی ئاگاداری‌و هۆشمەندیە ، پلوانی مـــەست مەعزوورن جا ئەو زانستەی شایستەی شوێن کەوتن‌و لاسایی کردنـەوە بێت برێتی‌یە لە زانیاریەکی بێداری نەك زانیاریەکی (مەستی)[1] .

لـــە نامەیەکی تردا دەڵێ : خوای گەورە سنگی فراوان کردم‌و یارمەتی دام بۆ زانینی ئەوەی کە پلەو پایەی ویلایەت هیچ نیە لە چـــاو پلەو پایەی پێغەمبەرێتی ، تەنانەت ئەو ڕێژەیەش لە نێوانیاندا نیە کە لـە نێوان دڵۆپە ئاوێك‌و دەریایەك دا هەیە ، ئەو خێرو بەرەکەتە زۆرەی لە ڕێـگەی پێغەمبەرێتی‌یەوە دەست دەکەوێت بەراورد ناکرێت لەگەڵ ئەو خێرو چاکەیەی کە لە ڕێـگەی ویلایەتەوە بە دەست دەکەوێت چونکە ئەفزەڵیەتی ڕەهـــا هـەر بۆپێغەمبەرانە ( درودی خوایان لەسەربێت )و ئەفزەڵیەتی هەندەکیش بۆ مەلائیکەتانە ، لێرەدا ئەوە ڕوون بۆوە کـــە هیچ وەلی‌یەك ناتوانێ بـگاتە پلەو پایەی پێغەمبەران ، بەڵـکو ســـەری ئەو وەلیانە وا لە ژێر پێی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت)[1] .

جا ئەگــەر ورد بیتەوە لە هەر مەسەلەیەك لەو مەسەلانەی کـــە ناکۆکی تێدا پەیدا دەبێت لە نێوان سۆفیەکان‌و زاناکاندا ، دەبینی هــەق لە لای زاناکانە ، نهێنی ئەمەش لەوەدایە کە ڕوانینی زاناکان بە هـۆی ئەوەی کە شوێن کەوتووی پێغەمبەران‌و خۆی دەکێشێتە ناو زانست‌و

(١) الرسالة رقم ٩٥ / الفكر والدعوة / ابو الحسن الندوي .

(١) الرسالة رقم ٢٦٦ / عثمان سەرچاوە .

کەماڵاتی پێغەمبەرێتی‌یەوە ، بەڵام ڕوانینی سۆفیەکان خۆیان بەویلایەت و زانست و زانینەکانی خۆیانەوە دەبەستەوە بێ گومان ئەو زانستەی لـــە نوری پێغەمبەرێتی وەردەگیرێت دەبێ ڕاستر و تەواوتر بێت لەو زانستەی لە پلەکانی ویلایەتەوە وەرگیرابێت[1] .

---

(1) الرسالة رقم ٢٦٦/٠ هەمان سەرچاوەی پێشوو .

## پارێزگاری شەریعەتی ئیسلام :

پەیوەندی بەستن بــــە خوای گەورەوەو ، بەهێزکردنی ئــــەم پەیوەندیەو هێشتنەوەی پارێزگاری کردنی لە بێ ئاگایی‌و مادەپەرستی‌و چارەسەرکردنی دەردە دەروونیەکان‌و نەخۆشی‌یە ڕۆحی‌یەکان ، لەگەڵ تێپەڕ بوونی ڕۆژگارو چەند جۆرەکی تر ناونراوە ( التصوف ) ، ئا ئەمە لە زاراوەی قورئانی پیرۆزدا ناوبراوە بە ( التزكية ) وە لــــە زاراوەی حەدیسدا بە ( الاحسان ) ، ئەم لایەنە بە یەکێك لــــەو چوار فرمــــانە دەژمێرێت پێغەمبەری بۆ نێرراوە . دەربارەی ئەمــــە خــــوای گــــەورە دەفەرموێ ( هو الــــذي بعث في الأميين رسولا منهم يتلوا عليهم آياته ويزكيهم ويعلمهم الكتاب والحكمة وان كانوا من قبل لفي ضلال مبين ) . الجمعة ئایەتی (٢) .

ئەمەیە ئەو کارە مەزنە بۆ دامەزراندنی ئایین لەسەر دوو لایــــەنی توێکڵ‌و ناوەڕۆك ، جەستەو ڕۆح ، یاساو عاتیفە ، کە بە دوامین پێغەمبەر سپێرراوە ، بەڵێ ئەم پیاوانە بوون ، هەستان بە نوێکاری‌و زینــــدوو کردنەوەی ئەم ( پزیشکی پێغەمبــــەریتی ) یەو پارێزگــــاری کردنی‌و گوێزانەوەی لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر ، هەر وەکو چۆن شەریعەتی

پیرۆزیان پاراستووە ، هەروا بە بەردەوامی خەریکی بڵاو کردنەوەی ( فقە الباطن ) فیقهی دەروونی بوونو بانگەوازیان بۆ کردووە ، لەگەڵ بڵاوکردنەوەی ( فقە الظاهر ) داو جێ بەجێ کردنیو ڕاگەیاندنی بـــە خەڵکی ، ئەو کارە پیرۆزەشیان بریتی بوو لە گرنگی دان بە ئوصولو بنەچە ، بتر لە فروعو لقەکان ، زیاتر باسکردنەکەیان پوختەی بابەتەکان بوو وەك لە درێژە پێدانو وردەکاری ، بەڵام کاتێ کە ڕووبەری ئیسلام فراوان بوو و ، وڵاتی نوێ هاتنە ناوئیسلامەوەو بانگەوازی ئیسلام بـە هەموو لایەکدا بڵاو بۆوەو ، سامانو سەروەتی زۆریان بەسەردا ڕژاو ، ڕێگای خۆژیاندن ئاسان بوو ، هۆیەکانی ڕابواردنو خۆش گوزەرانی زۆر بوو ، سەردەمی پێغەمبەریش دوورکەوتبۆوە ، تا لـــەم کــــاتەدا فەرمودەکەی خوایان بەسەردا سەپا کـە دەفەرموێ ( فطال علیهم الامـد فقسـت قلوبهم) ـ کاتێ زۆریان بەسەردا تێپەڕیو دڵیان ڕەق‌بوو نەخۆشی ڕۆحیو ، دەردی دەروونی بە هەموو شێوەو ڕەنگێکەوە پەیدا بوو ، لـە شێوەی بەرگی تیۆرییو فەلسەفەی نوێ خۆی پیشان دەدا ، ئیتر زاناکان لە ترسی ئەم بارە ناڵەبارە دەستیان دایـــە نوسینەوەی ( علم التزکیـــة والاحسان ـ زانستی دەروون خاوێن کردنەوەو خودا ناسین ) بـە ناوی زاراوەی نوێ ئەویش (تەصەوفە) •

بەڵام لەگەڵ چارەسەرکردنی نەخۆشیەکانی ڕۆح ، لەم ڕێگەیەوەو لە ژێر سێبەری ژیانو ڕەوشتەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ)دا بە هۆی تێکەڵاوی گەلانی ترو هۆکارەکانی ڕۆژگار ، هەندێ بیدعەتو خورافاتو ئەفسانە خۆی کوتایە ناو ئەم تەصەوفە خاوێنەو بێگەردەوە ، ئیتر میکرۆبی ڕەبەنیەتو گۆشەگیرییەکی بێ سنورو ، بە مەزنگرتنو پیرۆز کردنێکی زۆری ناڕەوایانەی ئەو پیاوانەی بەوەلیو چاکــە خواز

دەناسران باڵی کێشا بەسەریاندا . تا بەم جۆرە لەگەڵ تێپەڕ بوونی ڕۆژگار لە ناوەندە ڕۆحیەکاندا دابو نەریتی نامۆو عەقیدەی بێگانە خۆی دامەزراند ، تا گەیاندیانە ئەو ڕادەیەی هەر کەسێك لە ڕێگەی تەصەوفدا پاش خودا پەرستیەکی زۆرو پڕ لە ئیخلاص‌و بەجێ هێنانی زۆربەی سوننەتەکان بۆ ماوەیەکی تایبەتی‌و ، پاش وە دەست هێنانی زانیاریەکی زۆرو تەواو ئەوە دەگاتە پلەو پایەیەك ئیتر تەکلیفی شەرعی لەسەر نامێنێت‌و لەم کۆتە شەرعی‌یە ڕزگاری دەبێت‌و ئازاد دەبێت‌و چی بوێت دەیکات ، هیچی لێ حەرام نیەو هەموو شتێکی بۆ حەلاڵ دەبێت ، ئەم پلەیە پێیان دەووت ( سقوط التكاليف ـ لاچونی تەکلیفی شەرعی) .

ئەم بارە نالەبارو تازە داهێزاوانە لە سەرەتای سەدەی چوارەمی کۆچیدا بوو دەستی پێ‌کرد ، لە کاتێکدا کە دەوڵەتی عەباسی گەیشتبووە ئەوجی پێشکەوتن‌و ترۆپکی بەرزی ، بۆیە لەم کاتەدا بوو زانایان ڕاپەڕین بۆ قەلاچۆکردنی ئەم بیدعەت‌و عەقیدە نامۆیانە ، ناودارترین کەسێك لەم بیدعەتە ڕاپەڕی شێخی گەیلانی[1] بوو کە بەرزترین پیاوی تەریقەت‌و پێشەوای حەقیقەت بوو ، لە هەموویان زیاتر حەماسەتی پارێزگاریکردنی شەریعەتی تێدا هەڵدەقوڵا ، لە پەروەردەکردن‌و ڕێنمایی کردندا هەمیشە تەرکیزی لەسەر ئەوە بوو دەست بە سوننەتەوە بگرن‌و ، شوێنی شەریعەت بکەون لە کتێبە بە نرخەکەیدا ( غنية الطالبين ) جڵەوی تەریقەتی داوەتە دەست شەریعەت‌و ، لە کتێبی ( فتوح الغيب )دا داوای ئەوە دەکات شوێنی سوننەت بکەوین‌و لە بیدعەت دوور بکەوینەوە ، بەم وتە بەرزەی دەستی بە کتێبەکەی کردووە

---

(١) بە درێژی لە زنجیرەی دووەمدا باسی ژیانی گەیلانی کراوە .

( اتبعوا ولا تبتدعوا ) • له پاش شێخی گەیلانی شێخ ( شهاب‌الدین السهروردي )[1] بوو بەرەنگاری ئەم تەوژمە ناڕەوایەی کرد کە دەیفەرموو : ( تەصەوف بریتی‌یە لە ئیقتیدا کردن بە پێغەمبەر بە گوفتارو کردارو حاڵ ، بە بەردەوام بوون لەسەر ئەم ڕەوتە ، نەفسی سۆفیەکان خاوێن دەبنەوەو ، پەردە لەسەر دڵو دەروونیان لادەچێو ، ئەو کاتە ئەو شوێن کەوتەیان لە هەموو شتێکدا دێتە دی )[2] •

له سەدەی نۆیەمی کۆچی‌دا بوو ، بە هۆی کاریگەری ( شێخ محي الدين عەرەبی )و قوتابیەکانی‌یەوە تەصەوف گۆڕا بە فەلسەفەیەك کە پڕ بوو لە زاراوەی فەلسەفەی خوایەتی یۆنانی ( الفلسفة الالهية اليونانية )و ، تیوری ( وحدة الوجود ) بوو بە دروشمی سۆفیەکانو بە شانازیو سەربەرزیان دادەنا ، لە هەموو لایەکەوە سۆفیەکان ڕوویان لێ ناو ، تەکیەو خانەقاکان بوونە بنکەی عەقیدەو بیرو باوەڕی وا ، کە هیچ بەڵگەو دەلیلێکی لەسەر نەبوو ، موسڵمانانی سەدەکانی پێشوو هیچیان لەم بابەتانەوە نەزانیوە ••

جا لە هیندستاندا کە نزیکەی هەزاران ساڵە مەڵبەندی یۆگاو ڕەبەنیەتە ، بۆیە ئەو سۆفیانەی لە دەرەوەی هیندستان هاتبوون بەرەو ڕووی ئەم پیلوە بلیمەتو ڕیازەت کێشانەی یۆگا بونەوە ، ئەو پیاوانەی هێزی دەروونیانو هێزی خەیاڵیان چەندین جار بەهێزتر کردبۆوە ، لە ڕێگەی گرتنی هەناسەو وردبوونەوەی یۆگاییی ، تا لێرەدا بوو هەندێك لەو سۆفیە موسڵمانانە ئەم هونەرەیان لێوە فێر بوون ، ئەمە لە لایەکەوەو

(١) ئەم سەهرەوەردی‌یە جیایە لە سەهرەوەردی مەقتول کە ئیشراقی بوو •

(٢) رجال الفكر والدعوة لە ( عوارف المعارف ) وەری گرتووە •

له لایەکی تریشەوە ئـەم وڵاتانە دەربارەی ( الصحاح الستة )[1]ی پێشەوایان هیچیان نەدەزانی ، ئەو پێشەوایانەی کە زانستی حەدیسیان زۆر جوان بڕاو دەکردو تەتەڵەیان بێ کردووە ، چاکو خراپو ڕاستو ناڕاستیان لە یەکتر جیاکردۆتەوە ، بەرەنگاری بیدعەتو تازەداهێنراوی ( نەگونجاو لەگەڵ ڕۆحی ئیسلام)دا کردووە ئەوەیان سەلماندووە زیانی موسڵمانان دەبێ لەسەر باغەی سوننەتو پاکو بێ گـەردی ڕۆشنایی حەدیسی (صحیح)دا ، دابمەزرێت ٠

تا لەم سەردەمە باړو دۆخە نالەبارەدا کە نوێکاری‌و چاکەکاری‌و ئیمامی سەرهەندی دەستی پێ کرد ، لە سەردەمێکدا بوو کە سوننـەت بیدعەتو ، شەریعەت فەلسەفە بوو ، خۆیشی لە نامەیەکیدا بۆ کوڕی شێخەکەی ( محمد عبدالله )ی ناردووە دیمەنی ئـەم بارو دۆخـە نالەبارەی کێشاوەو دەڵێ

( لـەم ڕۆژانەدا بیدعەتو تازە داهێنراوی نامۆ بە ئەندازەیەکی نالەبار زۆر بووە ، بە ڕادەیەکە ئەوەی بە چاکی تێی بڕوانێ وا ئـەزانێ دەکات کـە دەریایەکی تاریـکی‌یەو شەپۆل دەدات ، نوری سوننەتیش لەناو ئەم دەریا سەرکەش‌و بێ ئامانەدا ، هەر وەکو گۆ ئەستێرە[1] ، لەناو ئەم تاریـکی شەوە زەنگەدا بڵاو بۆتەوەو )[2] ٠

ئیمامی سەرهەندی لەو کاتە ترسناکو بێ بەروایەدا لە هیندستاندا دەنـگی زوڵاڵی خۆی لێ بەرزکردەوە ، لە کاتێکدا خەریك بوو بن‌و بنەچەی ئیسلام لە ڕەگەو ڕیشەوە هەڵدەکێشرا بە دەستی وڵاتێك کە بە

---

(١) بریتی‌یە لە شەش کتێبی حەدیث ٠
(١) مێرووەیەکە بە شەو دەفڕێت لە پاشکۆیەوە دەدرەوشێتەوە ٠
(٢) الامام السرهندي / ابو الحسن الندوي ٠

ولآنی ئیسلامی ناسرا بوو ، زۆر به سوکیو نزمی‌یه‌وه لـــه ته‌کیـــه‌و خانه‌قاکاندا ، سۆفیه‌کان سه‌یری سوننه‌تی پێغه‌مبه‌ر صلی الله علیه وسلم یان ده‌کرد ، به‌ڕوونیو ئاشکرایی‌یه‌وه ده‌یان وت شه‌ریعه‌ت له دۆڵێکه‌و ته‌ریقه‌تیش له دۆڵێـکی تر ، هه‌ر یه‌که‌یان ڕێـگاو نه‌ریتی تایبـــه‌تی خۆی هه‌یه . تا له‌م باروو دۆخه تاریـکیو شڵه‌ژاوی‌یه‌دا ئیمـــام بـه‌و په‌ڕی هێزوو جه‌ـبره‌ته‌وه ڕای گـــه‌یاند ( ته‌ریقه‌ت خزمه‌تـــکاری شه‌ریعه‌ته‌و ، مل که‌چی فه‌رمانه‌کانیه‌تی ، چاکه خوازی شه‌ریعه‌ت زۆر به‌رزو مه‌زنتره له مقامات‌و ئه‌حوال‌و موشاهه‌دات ) به گوێ کردن بۆ یه‌ك حوکمی شه‌ریعه‌ت له ڕیازه‌ت کێشانی هه‌زاران ساڵ به‌سودتره ، قه‌یلوله‌کردن له‌به‌ر گوێڕایه‌ڵی بێت بۆ سوننه‌ت زۆر فه‌زڵی زیاتره لـه شه‌و زیندوکردنه‌وه‌و شه‌وگار به‌سه‌ر بردن ئه‌گه‌ر به‌بێ گوێڕایه‌ڵی‌و شوێن که‌وتنی سوننه‌ت بێت . کاری سۆفیه‌کان له حه‌ڵاڵ‌و حـــه‌رام کردندا هیچ بایه‌خێـکی نیه ، به‌ڵـکو بۆ ئه‌م کاره پێویست ده‌کـات به به‌ڵـگه‌ی قورئان‌و سوننه‌ت‌و کتێبه فیقهی‌یه‌کان ، ڕیازه‌ت کێشـــانی گومرایان شایسـه‌ی لەخوا نزیك کردنه‌وه نیه ، به‌ڵـکو موسته‌حـــه‌قی دوورخسته‌وه‌و نه‌فرین کردنه .

## هه‌ندێ له وته‌کانی ئیمام سه‌باره‌ت به‌م ڕاستیانه

( شه‌ریعه‌ت هه‌موو جۆره به‌خته‌وه‌ریه‌کی دونیاو قیامه‌تی گرتۆته خۆی ، هه‌ر مه‌به‌ستێك پێویستمان پێی بێت جگه له شه‌ریعه‌ت لـه هیچ شوێنێکی تردا به پلەو بێ گه‌ردی ده‌ستمان ناکه‌وێت ، ئه‌وه‌ی لــه لای سۆفیه‌کان هه‌یه له ( ته‌ریقه‌ت‌و حه‌قیقه‌ت) به هه‌ردوکیانه‌وه خزمه‌تکاری شه‌ریعه‌تن‌و یارمه‌تی ده‌رن بۆ به‌ده‌ست هێنانی ئیخلاص‌و نیـــاز پاکی ،

کەواتە دەرکەوت کە ئامانجی بەدەست هێنانی تەریقەت‌و حەقیقەت جگە لە تەنیق کردنی ناو کرۆك‌و ڕۆحی شەریعەت هیچی تر نیە )[1] .

( کاری سۆفیەکان سەبارەت بە حەرام‌و حەلاڵ بە هیچ جۆرێك حوججەو بەڵگە نیە ، ئەوەندە بەسە کە عوزریان بۆ بهێنینەوەو واز بهێنن لە لۆمەکردنیان‌و ، یان دەینەوە دەستی خوای گەورە خۆی حیسابیان لەگەڵدا بکات ، لەم بابەتانەدا وتەکانی ئیمامی حەنیفەو ئەبو یوسف‌و ئیمامی محمد بەڵگەیە نەك وتەکانی ئەبی‌بەکری شەبلی‌و ئەبی حەسەنی نوری بەڵگە بێت )[1] .

**لە نامەیەکی تردا دەڵێ :**

( پارێزگاری کردنی شەریعەت لە دڵی ئیمامی سەرهەندیدا بووە ئاوگیریەکی جۆشێنەر ، هەرکاتێك پێچەوانەیەکی شەریعەتی لەسۆفیەکان بیستایە ئەم ئاوگیریە تیایدا دەخرۆشاو دڵ‌و دەروونی لە ناخەوە دەبزواند ، لە ئاوا سنگی قوڵپی دەدا ، دەماری عومەریەت[2] لە ناخیا دەکەوتە لێدان‌و لە نوکی خامە بەتینەکەی هەروەکو لافاو غیرەت دەڕژا بۆ پارێزگاری سونەت‌و شەریعەت‌و ڕەت‌کردنەوەی بیدعەت ...

لە نامەی ژمارە بیست‌و پێنج‌دا کە ئاراستەی شێخ ( خواجە محمد شرف الدین )ی کردووە : ئەوەی ڕوون کردۆتەوە هەموو کردارێك بە پێی شەریعەت دەبێتە زیکر ، بۆیە پێویستە زۆربەی کاتەکان بە زیکری

(١) الرسالة رقم ١٣٦ / الامام السرهندي / ابو الحسن الندوي .

(١) الرسالة رقم ٢٦٦ / الإمام السرهندي / ابو الحسن الندوي .

خواوه خەریك بكرێت • لەبەر ئەوه دەبێت كاروباری ڕۆژانەمان هەمووی بە پێی شەریعەت بەڕێوه ببرێت تاوەكو خوای گەورە بە زاكرمان قەبوڵ بكات ، زیكریش بەمانای یادكردنەوه ، یانی دەبێتە لابردن و نەهێشتنی بێ ئاگایی ، ئەگەر ێتو بەپێرەوی فەرمانی شەرع بكرێت لـــە هـــەموو كردارێكدا ئەوا جیهان هـــەمووی ڕزگاری دەبێت لە بێ ئاگـــایی و لەبیرچوون ، ئەوەیش فەرمانی بەم كردارانە كردووه ئەوه پەروەردگار خـوێیەتی ) (١) •

---

(١) الامام السرهندي / ابو الحسن الندوي •

## ڕاست کردنەوەی عەقیدە :

ئەو سەرچاوە خاوێنەی ئیسلام لە ناو هیندستاندا کە تا ئەو کاتەش باغـــەی ئیسلامی تێدا کزو لاواز بوو ، لەبەر چەند هۆو ، هۆکارێکی مێژوویی جیاوازو ، سەرەڕای ئەوەی بوو بووە نیشتمانی چەندین گەلی بێ باوەڕو بت پەرست . بۆیە زۆر نەریتو بیروڕای ئەو ئاینـــە باوانە خۆی دەکوتایە ناو ئەو سەرچاوە پاکو بێگەردەوەو ترسی لەوەدا بوو ئەو سەرچلوەیە لە ناو تاریکی ون بێتو ئیتر کـــەس ئاوی ڕوونو خاوێنی زولاڵی ئیسلامیان دەست نەکەوێتو ئەمجا سەریان لێ بشێوێو هەتا هەتایە هەر بە تینوێتی بمێننەوە تامەزرۆی ئاوی شیرینی ئیسلام بن .. بۆیە ئیمامی سەرهەندی گەشتە نوێکاریەکەی دەستپێکردوە یەکەم هەنگاویشی لەم بوارەدا کە هەڵێنا ، لەسەر ڕێو ڕێبـــازی پێغەمبەران بوو ، لەسەر هەمان بەرنامەی ئەوان ملی ڕێگەی گرتەبەر ، ئەو ڕێگا گرتنە بەرەی بریتی بوو لـــەو هەنگاوانـــەی دەنرێت بۆ ڕاستکردنەوەی عەقیدەو ، ئاراستەکردنی ڕوانگەو تێڕوانین بەرەو ڕاستی .. بەڵێ سەرپێچی کردنی لە سوژدەی سڵاوکردن لەبـەر دەم سوڵتان جیهانگیرو ، ڕەتکردنەوەی ئەو بیدعەتە ترسناکو سامناکـــە ، نیشانەیەکی پرشنگدارە لە مێژووی چاکەکاریو نوێکاریدا ، بۆیە لـــە

زۆربەی ئەو نامانەی بۆ هاوڕێیانو شوێن کەوتوانی خۆی ناردووە ، باسی ڕوون کردنەوەی حەقیقەتی تەوحیدو یەکاپەرستی بە شێوازێکی ڕوونو پاراو باس کردووە ، بۆ خەڵکی ئەو سەردەمەی ڕوون کردۆتەوە .

بەڵێ ئیمـــامی سەرهەندی هـــەستا بە بەربەرەکـــانی کردنو ڕەت کردنەوەی هەموو دیاردەیەکی شیرکو بت پەرستی ئەوکاتەی لەناو هیندوستاندا بڵاوبۆوە ، بۆیە وڵاتی هیندستان بووە بارەگـاو مەڵبـەندی نوێـکاریـەکەی ، لەو کاتەی کـە خەریك دەبوو کەمایەتی موسڵمانان لەناو بتپەرستانو ئەفسانە پەرستانی ئەو سەردەمە دەتوایەوە ، لـەبەر ئەوەی ئیـسلام لەو ناوچەیەدا نوێ بوو و ، بە چاکیش لەناو خەڵـکیدا ڕەگی دانەکوتا بوو .. جگە لە ئیمام سەرهەندی زنجیرەیەك لـــــە شێخانی پایەبەرزی تر بە خاوو خێزانەوە هەموویان بەگشتی بەرەنگاری ئەو بیدعەتو ئەفسانەو بتپەرستیەیان کردووە لەوانە : وەکو حەکیمی ئیسلام ئیمام ( ولی الله الدهلوي )و ئەندامانی خێزانیو پاشان ئیمـــام ( احمد بن عرفان الشهید ) بوو ، ئەمانە لە ڕێـگەی خوتبەو نوسینو کتیب دانانـــەوەو وەرگێڕانو ڕاڤەکردنی قورئـــانو ، ناسـاندنـی فەرمایشتەکانی پێغەمبەرەوە بوو توانیان بەرەنـگاری ئەم شـــەپۆلەو تەوژمە بەتینەی کوفر بوەستنەوە .

## بلاوکردنەوەی سوننەتو ڕتکردنەوەی بیدعەت

بیدعەت بەوە پێناسە دەکرێت : تازە داهێنراوێکە لە ئاینــدا ، بێ ئەوەی خواو پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئەمـــەیان تێـــدا دانابێتو فەرمانیان پێ کردبێتو باوەڕیش بەرامبەر بەم داهێنراوە وابێت کە ئەمە بەشێکە لە ئاینو بەبێ ئەوە کاری پێبکرێتو دابو مەرجی وا پێـوە بەند بێت دەڵێی حوکمی شەرعییەو ، پێیەوە بەندە[1] . بیدعـــەت شەریعەتێکی دانراوە بەرامبــەر بــە شەریعەتی خوایی ، ئەویش فیقهو پێویستیو ئەرکو سونەتو مەندوباتی تایبەتی خۆی هەیە ، هـەندێك جاریش شان لە شانی شەریعەتی خوا بداتو هەندێك جاریش لە مەزنیو گرنگیدا بەسەر شەریعەتدا زاڵ بکرێت[1] .

ئیمامی سەرهەندی لە سەردەمی خۆیدا چونکە بیدعەت ئەمەندە زاڵ بوو بوو بەسەر ئایندا و بەرامبەر بە ئاینی ئیسلام پاگیر کرابوو ، وەکو ئاینێکی تری لێهاتبوو بۆیە ئەمەندە باسی بیدعەت دەکاتو ڕەتی دەکاتەوەو دژی دەوەستێ ، چونکە خەڵکی لە ئاین چاك نەگەیشتبوون

---

(۱) بـــە درێژی لە بەشەکانی پێشەوە باسی بیدعەت کراوەو ڕوون کراوەتەوە .

(۱) رجال الفكر والدعوة / ابو الحسن الندوي .

بــــه تەواوەتی باوەڕ پەکی له دڵەکــانیاندا دانـــەکوتابوو ، زوو هەڵدەخەڵاتانوو ، سەریان لێ تێك دەچوو ، ناچار ئیمام دژی هـــــەموو جۆرە بیدعەتێکی چاك و خراپ قسەی دەکرد ، تا دەروازەی خراپەکاری بە تەواوەتی دابخات ، بیدعەت وەکو لەوەو پێش باســـان کرد ، لــە ڕووی لەغزیەوە بەمانای تازە داهێنراو ئەگەر بەستراپێتەوە بە کاروباری ڕۆژانەی سەردەم ئەمە ئاین دژی نیە ، بەڵام ئەگەر ئەو تازە داهێنراوە بەسترایەوە بە ئاینەوە ئەوە ئاینی ئیسلام دژی دەوەستێ و بەرەنـــگاری دەبێتەوە .. جا بۆیە ناعەقی ئیمام سەرەەندی ناگیرێت کـــە بەو چەشنە بەرەنگاری هەموو جۆرە بیدعەتێك بۆتەوەو ویستویەتی دەرگا داخات لە ســــەر چوونە زوورەوەی شتی نامۆی وەکو یۆگـــاو ئیشراقیەت و فەلسەفەی یۆنانی و تێــــکەڵ کردنی بــــە ئاین .. ئەگینا موسڵمانانی ناوچەکانی تری ئیسلام بەم چەشنە نەبوون و بیدعەت وا بەســــەریاندا زاڵ نەبووە ... وەکو لەوەو پێش زانیت سوڵتان ئەکبەر چۆن شەریعەت و دەستورێــکی تری بۆ خۆی دامەزراندو ناویشی نا ( ئاینی ئەکبەرە ).. هەمیشە لەبەر تیشـــــکی ئەو فەرمایشتە پیرۆزەی دەفەرموێ ( ایاکـم ومحدثات الامور ، فان کل محدثة بدعة ، وکـــل بدعـــة ضلالة )(١) بیدعەتی ڕوون دەکردەوەو خەڵـکی لێ تێدەگەیاند .

هەمیشە هەواڵی ئەو پێش بینیەی پێ گەیاندوون کە دەفەرموێ ( ما احدث قوم بدعة الا رفع بها مثلها من السنة ) هەر کاتێ موسوڵمانان بیدعەتێك بهێننە کایەوە لە بەرامبەریەوە سونەتێك لادەبرێت .

ئەوەتا لە یەکێك لە نامەکانیدا دەڵێ :

---

(١) رواه احمد وابو داوود / مشکاة المصابیح .

ئەم سەردەمە ئەو چەرخەیە کە هەزار ساڵ بەسەر ناردنی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دا تێپەڕی کردو نیشانەکانی ئاخیر زەمان وا خەریکە دەردەکەوێت ، سوننەت بەهۆی دوورکەوتنەوەی لــە ســـەردەمی پێغەمبەرێتی وا داپۆشراوەو وازی لێهێنراوە ، ڕۆژگارەکە بووە بـــە ڕۆژگاری درۆو دەلەسەو بیدعەو داهێنراوی ناشیرین ، جیهان ئیسلامی چاوەڕوانی قارەمانێکە کە قودسیەتی سوننەت بپارێزێتو ، سەری بخات، بیدعەت لە ناو بەرێت ، چونــکە بڵاوکردنەوەی بیدعـــەت مراندنی سوننەتە بە مەزن‌گرتنی بیدعەت مانای ڕووخاندنی کۆشکی ئیـــلامــــە وەکو لە فەرمایشتێکی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دا دەفەرموێ ( مـن وقّر صاحب بدعة فقد أعان على هدم الاسلام )[1] .. هەر کەسێ ڕێز لە خاوەن بیدعەت بگرێت ئەوە یارمەتی ڕووخاندنی ئیسلامی داوە .

## یەکێتی بوون ( وحدة الوجود ) :

هەندێ لەو سۆفیە پێگەیشتوانەی مەستیو حاڵ بە ســـەریاندا زاڵ بوو بوو ، هەندێ قسە لە زاریان دەردەچوو بەڵگە بون لەســـەر یەکێتیبوون ( وحدة الوجود ) ، هەندێك لەوانە سۆفی بەناوبانگ ( ابي يزيد البسطامي ) بوو دەیگوت ( سبحان ما أعظم شأني ) یەکێکە لــەو شێخە گەورانەی زۆربەی زنجیرەو تەریقەتی سۆفیتی بۆ ئەو دەگەڕێتەوە یان قسەیەکی تری دەڵێ ( ليس في جبتي الا الله ) جگە لەُ خـــوا هیچی تر لە هەگبەکەمدا نیە . پاشان قسەکەی حەلاجیش کەوتە ناو ناوانسەوە کە دەیوت ( أنا الحق ) .

---

(١) رواه البيهقي مرسلا .

بەڵام شێخ محي الدین عـــەرەبی (٦٣٨)ك کە بە شێخ الأکبر )
ناوبانـگی دەرکرد بوو دامەزرێنەری ئەم ڕێبازو ڕاڕەوە بوو و ، لـــە
ڕوی زانستێتی ئەم ڕێبازەوە پێشەواو توێـکەرەوەی بوو ، ئیتر لـــەو
سەردەمەوە ئەم نەزعەو ڕێڕەوە تەشەنەی کردوو ڕەواجێکی تـــەواوی
پەیداکرد . جا زۆربەی ئەوانەی بەربەرەکانی شێخ محي‌الدین عەرەبیان
کرد بریتی بوون لە زانایانی حەدیس‌و فیقهـ‌و گەورە زانایانی تر بوون
لەوانە : ( حافظ ابن حجر العسقلاني ، العلامة السخاوي ، المفســر ابو
حيان ، شيخ الاسلام عزالدين بن عبدالسلام ، حافظ ابو زرعه ، شيخ
الاسلام سراج الدين البلقيني ، العلامة نور الدين علي بن سلطان محمد
الهروي ناسراو بە ( الملا علي القاري ) ، العلامة سعد الدين التفتازاني)و
زۆر لە پیاوانی بلیمەت‌و زانایانی تر لەم کارەدا بەشدار بوون ..

بەڵام ( شيخ الاسلام ابن التيمية ) لەو سەردەمەدا دادەنرێت بـــە
گەورەترین پێشەوای ئـەم بەربەرەکانی کردنەی ( وحـــدة الوجود )
ڕەخنەی لێ دەگرتن‌و بە چەشنێکی زانـستیانە شی دەکردەوە بۆیان ، زۆر
بە ئاشکراو سەربەستانە بەرامبەریان ڕای خۆی دەربڕی . لـــە ســـاڵی
٦٦١ی‌ك لە دایك بووە کە دەکاتە بیست‌و سێ ساڵ پاش وەفاتی شـــێخ
محی الدین عەرەبی .. ئەو کتێبانەی لەم بارەیەوە نوسیونی ئەمانەن
( جلاء العينين ، الفرقان بين الحق والباطل ، الرد الأقوم على فصـــوص
الحـــكم )[1] .

لەم سەردەمەی خۆشماندا ، کـە بە جوانترین شێوەو زانستیانـــە
باسی تەصەوف کرابێ‌و حەقیقەتەکەی ڕوون کرابێتەوەو ، هەڵەو ڕاستی

---

(١) الامام السرهندي / ابو الحسن الندوي .

لــە یەکتر جیاکردبێتەوەو باسی یەکێتی بوون (وحدة الوجود)ی کردبێ و ڕەخنەی تەواوی لێ گرتبێ ئەوە لە لایەن مامۆستـــا ( سەعید نورسی ) یەوەو ساڵی ۱۸۷۳ز لە دایك بووە لە ناوچـــەی کوردستانی تورکیـــا چاوەکانی بە شاخو کێوو ڕووباری ناوچەی نورس کراوەتەوەو هـاتۆتە دونیاوە ، لە ئەنجامی زیرەکی و بلیمەتی و باڵادەستیدا بە (بدیع الزمان) ناوبانـگی دەرکردووە ، ئەو باسەیشی لە پەیامێکدا نوسیوە بـــە نـاوی ( التلویحات التسعة ) .

ئومێد شەمشەك قوتابی مامۆستا نورسی و زانای تورکی سەبارەت بە یەکێتی بوون ( وحدة الوجود ) دەڵێ :

بەڵێ شتەکـانو ڕووداوەکان جیـاواز دەردەکەوێ بە پێی ئـەو ڕوانـگەیەی لێوەی دەڕوانی بۆیان ، ئەمە ڕاستە ، بەڵام ئـــەم شـتو ڕووداوانەش بدرێتە پاڵ ڕاستی یەکی دیاریکراو هەر ڕاستە . بۆیـــە پێویستە خۆ بپارێزرێت لە چونە ناو پەرگیری و زیادە ڕەوی کـــە بەرەو نکارکردنی بونی حەقیقەتێکی جێگیری شتان دەکات یان برۆ پاگەندەی نەبونیان دەکات ئەمە ڕێبازێکە قورئانی پیرۆز ڕەتی دەکاتەوە کە دەفەرموێ ( فانظر الى آثار رحمة ربك ) یانی بڕوانە شوێنەوارو جـــێ دەستی ڕەحمەتی پەروەردگارت . چۆن دەبێت ئـەم شوێنەوارانە نەبوو بن ؟ چۆن دەبێت پاڵ پشتێکی ڕاستەقینەیان نەبێت ؟ فرمانو کاری بوونـــەوەر ئەوەیە کـە بێتە ئاوێنە بۆ ناوە جوانەکانی خوا ، ئەو وتەیەی دەڵێ ئەم ئاوێنەیە جـــگە لە خەیاڵ هیچی تر نیە ، بـــە مانا دروەشانەوەی ناوە جوانەکانیش جگە لە خەیاڵو وەهم هیچی تر نین ، ئا ئەمەیە ئەو هـەڵە شاراوەیەی لە ڕارەوی ( وحدة الوجود ) دا هەیە کە دەڵێ (لا موجود الا هو ) یانی بوونەوەرو درەوشانەوەی ناوە جوانەکانیش تێیدا بـــە

خەیاڵو وەهم دادەنێت • هەروەها بڕوانینە بوونەوەر بەو جۆرەی بەشێکە لە خوای گەورە ( حاشا لە خوا ! ) کە دەیخەنە سەر ( وحدة الوجود ) ئەمەش هەڵەیە ، ئەمە تەنها هەر ڕوانینێکی هەڵە نیەو بەس بەڵکو ڕوانینێکە بە تەواوەتی لە حەق لایداوە ، پێویست دەکات مەبەستو ئامانجە شاراوەکانی بشکێنرێت ، ئایا عەقڵ ئەمە وەردەگرێت کە سەیری (الرحمن)و ئاثاجانی ڕەحمەتو ، (الجبار)و موجودات بە یەك چاو بکەین کە هیچ ناتوانن جگە گوێ ڕایەڵیو تەسلیم بوون بەو نەبێ •• گەر بڕوانینە (المیت)و ئەوانەی کە ڕۆحی خۆیان تەسلیم بەو دەکەن •• ئایا عەقڵ ئەمە بەگەن دەکات کە سەیری هەردووکیان بەیەك چاو بکرێت ؟ ئەمە شتێکە کە قورئانو عەقڵو تەصەوفیش ڕەتی دەکاتەوە !(١) •

---

(١) الانفجار الكبير او مولد الكون ، ترجمة ـ اورخان محمد علي •

## یەکێتی بینین ( وحدة الشهود )[1] :

لــــە جــوار چێوەی سنووری ئەم نوسینەدا دوو کەسی ناودار دەناسێنین کە فیکرەی یەکێتی بینین ( وحدة الشهود )یان هەبوو بەرامبەر بە ( وحــدة الوجود )و بە چەشنێکی جۆراو جــۆر دەست نیشانیان کردووە ، لەگەڵ ئەوەشدا لە نێوانیاندا جیاوازی زەوق‌و مەشرەبیش هەبوو ، لە هەمان کاتدا لە ڕووی بەرنامــــەو شێوازی بانــگەواز کەندەڵاێنکی پانو بەرینیش لە نێوانیاندا بووە ، تەنها ئەوەندە بووە کــە لە نێوانیاندا یەکێتی ئیخلاص‌و پاکی نیــازو چاکی زەوق‌و ڕاستێتی فیطرەش هەر هەبووە ، هۆکەی هەر ئەمە بووە کە دەروازەی ڕانمایی پەروەردگاریان لێ دەکرێتەوە ( والذين جاهدوا فينا لنهدينهم سبلنا )٠٠ یەکێکیان شێخ الاسلام ( الحافظ ابن تيمية ) بووە کە ( محدّث ، متكلّم، فقيــه )یش بووە ، ئەوی تریان ( ئیمام شرف الدين يحيى المنير ) بووە کــە خودا ناس‌و موحەقیق بووەو لە پێشەوایانی تەصەوف‌و ئیحســـان بووە ( ابن تيمية ) لە کتێبی ( العبودية ) کەیدا باسی یەکێتی بینین (وحدة الشهود)ی کردووەو ئەوە دەردەخات کە ئاگای لەم ڕاستی‌یە هــەیەو دێتە ڕێــگەی سۆفیەکان لە کاتی پەروەردەکردن‌و سلوك کردنیــاندا ، ئەم پلەیەش نە ئەگاتە پلەی پێغەمبەرانو نەدەشگاتە پلەی صەحابەکان٠٠

(١) الامام السرهندي / ابو الحسن الندوي ٠

بەلام ئەوەندەیە پلەیەکە لە سەرووی پلەی ( وحدة الوجود )ەوە یەو زۆریش لەو باشترەو بەرزترە ، بەلام چونکە خۆی بەم حالەدا نێ نەبەڕیوە تەنهـا بەوەندەوە دەوەستێت‌و هەر ئەوەندەیە ئیشارەتی بۆ دەکـات •

بەلام شێخ المنیری لە نامەکانیدا بەدرێژی باسی کردووەو لەبەر تیشکی ئەزمونی کەسێتی خـۆی‌و لێکدانەوەی زانستیانە لەم بارەیەوە دەڵێ :

( ئەوەی وا تێ دەگات ( وحدة الوجود )و نەمانی هەموو بونێـك جگە لە ( واجب الوجود ) ، نەمانی تەواوە ، شوێنەواری نامێنێ ، ئـەوە لە ڕاستیدا هیچ نیە جگە لە ئاوا بوونی مەوجودات لە ئاستی وجـودی حەقیقی بوون ، هەروەکو چۆن تیشکی ئەستێرەکان لە بەرامبەر ڕووناکی تیشکی بەتینی خۆر ون دەبن ، ئەتۆمەکان وایان لێ دێت هـەروەکو نەبن وانـە ) •

هەر دوو تیۆرەکە لەوەدا پوختە دەکرێ کە ( نەمان‌و لەناوچوونی شت ، شتێکەو نەدیتنی شتێکی ترە ) ••• کەواتە یەکێتی بینین بریتی‌یە لە ( حلّ نەك زانستێك یان بیرو باوەڕێك بێت ، لە سـەر بناغـەی پەیوەندی بوونەوەرو پەروەردگاردا دادەمەزرێت ، ئەویش پەیوەندیەکی ڕۆحی‌و زانێکی دڵی‌یە ، سەرچاوەکەی گوڕینەوەی خۆشەویستی‌یە لە نێوانیاندا ، ئەم پەیوەندیە زەوقی سۆفیتی‌یە دوانەتی نێـوان خالق‌و مەخلوق ، خواو مرۆڤ تەئکید دەکات‌و بە جۆرێك کە خوای گـەورە بە زات‌و سیفاتیەوە جیاوازە لە ئادەمیزاد هەروەکو لە قورئان‌و سونـەدا باس کراوە[1] •

---

(١) الصوفي الشهيد / المحامي بوتان معروف جياووك •

## ئاتاجی کەسێتی‌یەکی نوێخوازی نوێ :

ئەوەی لــەو سەردەمەدا زۆر گرنگ‌و پێویست بوو پەیدا بێ ، بریتی بوو لە پەیدا بوونی کەسێتی‌یەکی نوێ - بۆ تەتەنەکردن‌و ڕوون کردنەوەی ئەو فیکرەیە ، تاوەکو بێت بە حوججە بەسەر خەلکی‌یەوەو - بە جۆرێك ئەو کەسە خۆی تێبو دۆلی سلوك‌و ئیشراقی پڕ لە دڕك‌و داڵی بڕیبێ‌و بە ناو کون‌و قوژبن‌و بەرزو نزمی‌یەکانیدا تێپەڕی بێت‌و ، بە سەر پلەو پایە بەرزەکانیدا سەرکەوتبێ‌و ، لە ناو دەریاکانی مەعریفەتی خوایی‌و حەقیقەتی پەروەردگاریدا مەلەوانی کردبێ‌و ، لــــە دەریای ســـەرکێش‌و شەپۆلاوی بـــە ئەزموونی تەتیقی کرداریدا بۆ ڕۆخی حەقیقەت پەڕیبێتەوەو ، نەزانی بـــە شتێك ناکاتە بەلــگە بۆ نەبوونی ، بەلــکو وەکو بینەرو گەشتیارێکی فیداکاری خۆش هیواو بـەـو پەڕی تواناو متمانەو بەصیرەتەوە دەلێ : « هەموو کون‌و کەلەبەرێکی ( وحدة الوجود) دەزانم ، بەلــکو هەموو تەتۆێکی ئەم خانووە دەناسم‌و ، پیایدا تێپەڕیوم ، پەیوەندیم لە گەلیدا بەردەوام بوو ، پاشان دەلێ : « بەلام لە پشتی ئــــەم هەسارەو ئەستێرانەدا جیهانێکی ترو مەودایەکی فراوانتر

هـــەیە »[1] .

لەو سەردەمەدا سێ مەزهەب هەبوون سەبارەت بـــە تیـــۆری ( وحدة الوجود ) :ـ

(١) لایەنگیری تەواوی ئەو تیۆرەیان دەکرد بەوەی کـە ( وحدة الوجود) حەقیقەتێکی بەڵـگە نەویستەو ، ئەوپەڕی ئامـــانجی زانین‌و ڕاستی‌یە .

(٢) پشت تێکردنی تەواو لە تیۆری ( وحدة الوجود ) ، دەیان وت جگە لە وەهم‌و خەیاڵ‌و دیتی دەروونی نەبێت هیچی تر نیە .

(٣) پێش‌کەش کردنی تیۆری یەکێتی بینین (وحدة الشهود) لـــە جیاتی یەکێتی بوون (وحدة الوجود) ، یانی واقع‌و ڕاستی ئەوەیە کـــە بونەوەران بونیان هەیەو لە جێگای خۆیانن ، بەڵام نوری وجـــودی حەقیقی ( واجب الوجود )ە بونیانی لە بەرچاو شاردۆتەوە ، هەر دەڵێی نیەو نەبووە ، وەکو چۆن ئەستێرەکان پاش هەڵهاتنی خۆر لـــە ئاستی تیشکی بەتینیدا وردە وردە کز دەبن تا ئاوا دەبن ، جا ئەگـــەر هـــەر کەسێك بڵێ : ئەستێرەکان دیار نین ئەوە لە ڕاستیدا درۆی نەکردووە ، هەر بەم چەشنەیە کە ئەم بوونەوەرانە لە ئاستی وجودی تەواوو حەقیقی وردە وردە کز دەبن‌و بچوك دەبن‌و تا لە چاو ون دەبن بە جۆرێك هەر دەڵێی نین‌و نەبوون )[1] .

---

(١) مەبەستی هەسارەو ئەستێرە ، جیهانی ( وحدة الوجود )ە کـــە ڕانەو بەرینـــە .

(١) الامام السرهندي / ابو الحسن الندوي .

## پلەی ئیجتهادو نوێکاری ئیمامی سەرهەندی :

ئیمامی سەرهەندی بەرامبەر بەو سێ مەزهەبەی باسمان کرد ، مەزهەبی چوارەمی گرتە بەر ، ئەویش ئەوەیە کە (وحـــدة الوجود) مەقامێکە دێتە ڕێی ڕێگرانی تەریقەت لە کاتی سلوك کردندا ، وا دێتە پێش چاوی‌و بە ئاشکرا دەبینێ کە هیچ بوونێك نیە جگە لە ( واجب الوجود ) ، ئەوەی لەبەر چاوی مرۆڤدایە لەم بوونەوەرانە هەموویان یەك بوونیان هەیەو یەك وجودن ، بەڵام ئەگەر یارمەتی پەروەردگاری لە گەڵدا بێت‌و پشتگیری لێ بکات‌و بە ڕێنمایی پێغەمبەر صلی اللە علیه وسلم بڕوات‌و لەسەر ڕێ‌و شوێنی ئەو بڕوات‌و ئەو سۆفیەش هیمەتی هەبێت‌و خۆش هیوا بێت ، ئەوا مەقام‌و پلەیەکی تری دەست دەکەوێت ئەویش مەقامی ( وحدة الشهود )ە .

بەم چەشنە ئیمامی سەرهەندی لەگەڵ بەرپەچدانەوەی تیۆری ( وحدة الوجود ) کە ڕێبازی زۆربەی سۆفی‌و حەکیمە وردەکارو ئیشراقیە ڕۆچووەکان بوو ، لەگەڵ ئەمەدا دانی نا بە پایەو گەورەیی دامەزرێنەری تیۆرەکە لە ڕووی زانستی‌یەوە ئەویش شێخ محی الدینی عەرەبی‌یە ، شتی تری نوێی خستە سەرو جیهانێکی نوێی لـــە ڕووی

خەڵکیدا ئاوەڵا کرد ، کە لەگەڵ عەقیدەی گشت موسڵمانێکدا دەگونجا لە هەمان کاتدا لەگەڵ قورئانی پیرۆزو سوننەتو شەریعەتی ئیسلامیشدا دەگونجا ، ئەمە لە لایەکەوە ، لە لایەکی ترەوە ئەوانەی کە هێناونیو زیادی کردوون نەبۆتە هۆی ئەوەی پاڵ بە زانیاریەکانی ترەوە بنێت بەرەو دواوەو ، لێکۆڵینەوەو بۆچوونی کۆمەڵێکی زۆر گەورەی خاوەن زانستو زانین بە تەواوەتی بسڕێتەوە چونکە ئیمامی سەرهەندی خۆی بە چاوی خۆی لە ڕێگەی تاقیکردنەوەو ئەزموونی خۆیەوە ئەو ڕێگەو ڕێبازەی دیوەو بڕیوەتی ، چونکە هەر لە منداڵیەوە سەرگەرمی تەصەوف بووە هەر لەناو خێزانێکی سۆفی خوازیشدا گەورە بوومو نەشو نمای کردووە ، لەبەر ئەوەیە وەکو خۆی باسی دەکات سلوکی کردووەو مەقامی ( وحدة الوجود )ی تێپەڕاندووەو پاش ئەوەی کە چەندین ساڵو مانگ تیایدا ماوەتەوە ، تا گەیشتۆتە مەقامی ( وحدة الشهود )[1] .

---

(1) هەمان سەرچاوەی پێشوو .

## لێهاتوویی‌و بلیمەتی ئیمامی سەرهەندی :

تێکۆشانە نوێکاریەکەی ئیمام لە ئیسبات کردندا بـە بەڵـگەو دەلیلەوە هەر لەوەدا نەبوو کە تیۆری ( وحدة الوجود ) ڕەت‌کـاتەوەو ئەوە دەرخات کــە بەکەڵك نایێت بکرێت بە پێوەرێکی ڕاست‌و دوا ئامانجی ڕێـگرانی ڕێـگەی تەصەوف ، بەڵـکو لێ هاتوویی‌و بلیمـەتی لەم بوارەدا لەوەدا دەردەکەوێت ئەم تیۆرەی دایە بەر نەشتەری ڕەخنەو لێکۆڵینەوە لەبەر تیشکی ئەزمونی کەسێتی‌و دیتی خودی خۆی ، ئەمجـا بۆ خەڵـکی سەلماندا کە بە قوڵایی‌و بن‌و بنەچەی ئەم دەریایەدا چۆتـــە خوارەوەو ، گەیشتۆتە بنی دەریاکەو ، ئەمجا سەرکەوتۆتەوە ، دەستی پەروەردگار لەگەڵیدا بووەو دەستگیرۆیی کردووە،تا توانیویەتی کەشتی زانستی‌و لێکۆڵینەوەکەی بەرەو ڕۆخی ئاشتی‌و ئاسایش ئاڕاستە بکات‌و بگەڕێتەوە وشکایی ، لەم بوارەدا کەم کەس دەتوانێ شان لەشانی بدات بۆیە نوســـەری ڕۆژئاوایی ( بیتر هاردی ) دەڵێ : ( نهێنی ئـــەو سەرکەوتنەی شێخی سەرهەندی بەدەستی هێنا ، لەوەدایە کە ئیسلامی ناو هیندستانی لـــە ڕێـگەی تەصەوفەوە ڕزگار کرد لـە زیادەڕەوی‌و بەرگیری‌و تێکدانی سۆفێتی ، لەوانەیە هۆکەی لەوەدا بێت ئەو تیۆرەی کە ڕەتی کردەوەو بەربەرچی دایەوە ، زۆر بەچاکی لە ماناو مەبەست‌و گرنـگی‌و ترسناکی تێگەیشتبێت )[1] .

---

(١) هەمـــان سەرچاوەی پێشوو .

## بێدەنگیو ئاراستەکردنی وڵات بەرەو ئیسلام :

ئەوەی لێرەدا گرنگە پێش ئەوەی باسی تێکۆشانە سەرکەوتوانەکەی ئیمام بکرێت کە بۆی هەڵساوەو توانی ڕێڕەوی وڵاتو تەوژمە بەنینەکەی بگۆڕێ ، ڕاستی‌یەکی گرنگ هەیە دەبێ بیخەینە ڕوو ، ئەویش ئەوەیە نابێ وا تێبگەین لە سەردەمی شا ئەکبەردا لە ناوەندی ئەو هەموو شێوانو شڵەژانەدا کە بوو بوە چەوسانەوە بۆ خەڵکی ، بێ دەنگی تەواو باڵی بەسەر خەڵکیدا کێشابێو لەم سەرو ئەوسەری وڵاتدا ئیتر قوڕوقەپ کرابێو کەس نەیوێرابێت ورتە بکات ، هەروەها لە ناو زاناکاندا کەس نەبوو بێت قسە بکاتو ڕەخنە لە ( ئەکبەر ) بگرێتو بەرامبەری وەستابێتو بەپێی ئەو فەرموودەیە کردەوەی نەکردبێت کە دەفەرمووێ :

( من رأى منكم منكراً فليغيره بيده فان لم يستطع فبلسانه فان لم يستطع فبقلبه ، وذلك أضعف الايمان )[1] .

بۆیە لێرەدا هەندێك لەو پیاوانەی هێزو توانای خۆیان خستە کارو

---

(١) متفق علیه .

خستە ڕوو لە دژی ئەو بارو دۆخەی ئەوکاتە دەخەینە ڕوو : جارێکیان شێخ ( ابراهیم المحدث الأکبر آبادي ) دەچێ بۆ پەرستگاکەی شا ئەکبەر لەسەر داوای خۆی لەم چونەیدا پەیڕەوی ئەو دابو نەریتەی نەکرد کە شا ئەکبەر دانابوو بۆ چوونە لای ، ئەو دابو نەریتەی لەبنەڕەتدا پێچەوانەی شەریعەت بوو ، ئەم شێخە زۆر لەگەڵ ئەکبەردا دوواو ، ئامۆژگاریەکی زۆری کردو خوای دەخستەوە یادی ، بێ ئەوەی لە شانو باهووی پاشایی بسەلمێتەوە .. شێخ ( حسین الأجمیر)ی کە لە ساڵی ١٠٠٩ی‌ك وەفاتی کردووە ، شاری ئەجمیری بەجێ هێشتووە لە دژی شا ئەکبەر ، کاتێ کە دەچێتە ئەجمیر ، لەبەر ئەوە شا ئەکبەر لە چاودێری کردنی تەکیەکەی باپیری ( معین الدین الجشتي )ی لەبەجێ نزرگاکەیدا لای دەباو دووری دەخاتەوەو دەینێرێ بۆ حیجاز ، کاتێ کە گەڕایەوە بۆ هیندوستان سوجدەی سلاوی بۆ نەبرد ، سوڵتان لێی توڕە دەبێو فەرمان دەکات بە بەندکردنی لەقەڵای (بکەر)دا ، بۆ ماوەی چەند ساڵێك دەمێنێتەوە پاشان ئازادی دەکات ، کاتێ کە لەبەردەمیدا ئامادە بوو ، ڕازی نەبوو بەو چەشنە سلاوی لێ بکات کە دەستوری دەوڵەت دایناوە ، ئەمجا دیاری سوڵتانیشی وەرنەگرت .

جارێك سوڵتان زۆر توڕە دەبێ لە شێخ ( سلطان التهانیري ) ـ کە یەکێك بووە لە پیاوە نزیکەکانی خۆی ، سوڵتان فەرمانی ئەوەی پێ کرد بوو کتێبی پیرۆزی هیندیەکان ( مها بهارتا ) لە زمانی سانسکریتیەوە بگۆڕێتە سەر زمانی فارسی ـ هۆی توڕە بونەکەی ئەوە بوو هیندیەکان بەوە تاوانباریان کرد بوو کە مانگای سەربڕیوە چونکە سەربڕینی مانگا لە دەستوری خوایە نوێکەی ئەکبەری‌دا قەدەغە کرابوو ، بۆیە فەرمانی دەرکردنی دەرکرد بۆ (بکەر) لە ناوچەی

( سەندا ) لە ئەنجامی ئەوەی کە هەڵوێستی ئیسلامیانەی زۆری نواند بوو فەرمانی لە فەنارەدانی دەرکرا لەلایەن (ئەکبەر)ەوەو ساڵی (١٠٠٧)ی ك جێ بەجێ کرا •

گەورەترین هەنگاو کە ئازایانەو بەجەرگانە نرابێت هەنگاوەکەی شێخ ( شەباز کنبوە )بوو ، لە میرە گەورەکانی کۆشکی سوڵتان ئەکبەر بوو ، خاوەنی جەسارەتێکی وابوو هەرگیز درێغی نەکردووە لە وتنی وشەی حەق لە لای سوڵتان ، لێی نەدەترساو گوێی نەدەدایە ڕەزامەندی شائەکبەر ، ڕیشی کورت نەدەکردەوە ، مەیی نەدەخواردەوە هەرگیز ئارەزووی لەو ئاینە نوێیەی ئەکبەر نەبووە • • ڕۆژێك سوڵتان ئەکبەر لە نێوان عەسرو ئێوارەدا لەگەڵ (شەبازخان)دا لە قەراغ گۆمێك لە (فەتحبور) دا پیاسەی دەکردو دەستی شەبازی گرتبوو ، خەڵکی چاویان لێیان بوو ، دەیانووت شەباز نوێژی عەسری دەفەوتێ چونکە ئیتر ناتوانێ دەستی لە دەستی سوڵتان ئەکبەر بەردات بۆ نوێژکردن ، بەڵام کە شەباز زانی وا خۆر خەریکە ئاوا دەبێ‌و نوێژەکەی خەریکە بفەوتێ ڕوخسەتی لە سوڵتان وەرگرت بۆ ئەوەی نوێژەکەی بکات ، سوڵتان پێی وت نوێژەکەت دوایی بکێڕەرەوەو بە تەنها بەجێم مەهێڵە بۆیە (شەباز) دەستی لە دەستی راپسکاندو هیچ گوێی نەدایە قسەکەی‌و بەرماڵەکەی ڕاخست‌و نوێژی خۆی دابەست‌و پاش نوێژەکەش ویردی خۆی خوێند •• لەم کاتەشدا سوڵتان بەسەر سەریەوە ڕاوەستاوەو هەر هەڕەشەو گوڕەشەی لێ دەکات‌و بەتەواوەتی ڕقی هەڵساوە ، لەم کاتەدا ( میر ابو الفتوح )و (حکیم علی الکیلانی) خواو ڕاسان پەیدا بوون‌و هەستیان بە ناسکی ئەم هەڵوێستە کردو لێیان چوونە پێشەوەو وتیان ئێمەش شایستەی ئەوەین کە سوڵتان ڕوومان تێ بکات • مەبەستیان ساردکردنەوەی سوڵتان بوو •• ئیتر

سوڵتان تۆزێك هێدی بووەوەو ، ڕووی لە شەهباز وەرچەرخاندو ڕووی کردە ئـــەوان •

هەروەها شێخ ( عبدالقادر الأجی ) ش یەکێك بوو لەو پیاوە ئازاو بەجەرگـــانەی ، هـــەرگیز لایەنـگیری سوڵتانی نەکردووە هەرکاتێ سەرپێچی لە شەریعەت کردبێت ، ڕۆژێك (ئەکبەر) بـــە پێی نەریتی خۆی ئەفیونی پێشکەش دەکـــات ، ئەمیش بەقسەی نەکردوو لێی وەرنەگرت سوڵتان ئەم ڕەفتارەی زۆر پێ ناخۆش بوو ، ئەم ڕقەی لـــە دڵدا هەڵـگرت تا ڕۆژێ بەهانەی لێدۆزیەوە ، بینی ئەوا شێخ (الاجي) لە پەرستگای کۆشکدا کە ئەکبەر دروستی کرد بوو نوێژ دەکات ، کـە لە نوێژی فەرز بۆوە ، نوێژی سوننەتی کرد ، ئەکبەر هاتە لای‌و پێی وت چاکتر وایە لە ماڵی خـــۆتا سوننەت بکەیت ، ئەمیش پێی وت قوربان ئەم شوێنە موڵـکی تۆ نیە تا لە ژێر فەرمانی تۆدا بێت بۆیە سوڵتان زۆر لێی توڕە دەبێ‌و پێی دەڵێ : ئەگەر بە موڵـکی مـــن ڕازی نیت فەرموو بجۆرە دەرەوە ، ئیتر شێخ خێرا لەوێ دەردەپەڕێ‌و هـەر ئەو شارەش بەجێ دەهێڵی‌و دەچێتە شاری ئەج ، خەریکی خواپەرستی‌و پەروەردە کردنی خۆی دەبێ ، هەروەها ( سـیە عبدالقادر اللاهور )ی هەرگیز سوڵتان لێی ڕازی نەبووە چونکە زۆر بە توندی‌و چالاکیەوە دەستی بە ئاینی ئیـسلامـەوە گرتبوو ، لەبەر ئەوە سوڵتان دەری کردو ئەویش چوو بۆ شاری مەککەی پیرۆز •• هەر بەم چەشنە شێخ ( منور بن عبدالحمید اللاهور ) لەبەر ئاین پەروەری‌و ڕەوشتبەرزی‌و ئیـــمان دامەزراوی ، سوڵتان لە بەندیخانەی توند دەکات تا ئەمـــری خـــوا بەجێدێنێ [1] •

(١) الامام السرهندي / ابو الحسن الندوي •

## تایبەتێتی ئیمام سەرهەندی لە نێوان ئەم خەڵکەدا

بەڵام لـــە بەربەرەکانی کردنی باری تێکچووو ، گومڕا بوونی وڵاتو بەرگریکردنێکی بەهێزو تواستێکی ڕێكو پێكو ، تێکۆشـــانی چالاکانەو حەکیمانـــە کـە کرا بۆ چـــاك کردنو ڕاست کردنەوەی دەولەت ، فەزڵی گەورە بۆ ئیمامی سەرهەندی دەگەڕێتەوە . خـــوای گـــەورە بۆ پارێزگاری ئاینو سەرخستنی ئیسلامو ڕاست کردنەوەی موسڵمانان ئامادەی کردبوو ، ویستی پەروەردگار وابوو ئەم نوێـکاری یە مەزنە بەم سێرێ کـە شـەوو ڕۆژی خستبووە ســـەریەك بۆ تەواو کردنی ئەو نەخشەو بەرنامە نوێخوازی یەو ، هەڵگیرساندني ئەو شۆڕشە بێ دەنگو هێدی یەی تۆکێ خوێنی تێدا نەڕژاو ڕەوڕەوەی مێـژووی ئیسلامی لە هیندستان بە تایبەتیو لە جیهانی ئیسلام بە گشتی گۆڕی ، کـە وێنـەی ئەم جۆرە شۆڕشانە لـە جیهاندا زۆر دەگمەنە لە ئاکامی ئەم هەوڵدانەدا پاش مردنی سوڵتان (ئەکبـــەر) بەڕێوە بردنی وڵات دەکەوێتە دەستی کەسێك زۆر چاكو پڕ لە خێر بوو ، دەماری ئیسلامی تیایدا بەهێز بوو ، حورمەتی ئاین لە لای مەزن بوو ، میکرۆبی دژایەتی ئیسلامی تیادا نەبوو زنجیرە زێڕینی بنەماڵەی ئیمام سەرهەندی هـــەروا بەردەوام بوون لە تێکۆشانیاندا تا لەسەر دەستی سوڵتان ( محي‌الدیـن اورنك زیب )دا گەیشـتە ترۆپـکی بەرزیو ئەوجی پێگەیشتنو بـــە تەواوەتی ڕێو شوێنی خەلیفەی ئیسلامی ڕاستەقینەیان گرتەبەر کـــە ئەوپەڕی ئاواتی موسڵمانان بوو [1] .

---

(١) هەمان سەرچاوە .

## سولتان جیهانگیرو پاشایەتی

کاتێ کە سولتان ( جلال الدین اکبر ) ساڵی ١٠١٤ی کۆچی دەمرێ ، لەو کاتەدا ئیمامی سەرهەندی لە تەمەنی ٤٢ساڵیدا دەبێ ، لە دوا دوایی ژیانی سولتان ئەکبەردا فیتەو ترسناکی یەکی زۆر لە هیندستاندا تەشەنەی کردو ، ئیسلام هەڕەشەی ڕووخانو لەناوچوونی لێ دەکرا ، تا لەو کاتەدا بوو کە ئیمامی سەرهەندی تیایدا گەیشتبووە کەماڵی ڕۆحیو پێگەیشتنی فیکریو ، ترۆپکی پاکیو خودا پەرستی ، لەو کاتەدا هیچ پەیوەندیەکی بەمیرو پیاوانی وڵاتەوە نەبوو ، لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا کاتی ئەوە نەهاتبوو پیاوانی کۆشکو پایە مەزنی ، شانو شەوکەوتو شکۆداریو ئیخلاصو خودا پەرستی تەواوی پێگەیشتوویی دەروونی بزانن لێی بە ئاگا بن ، هەر لەبەر ئەوە بوو دەست پێکردنی کارەکەی ئیمامی سەرهەندی لەوەدا نەبوو کە هەستو بیروڕای ئاراستەی کۆشکی پاشایەتی بکاتو کاربکاتە سەر سیاسەتی گشتی وڵات ، لەو ڕووانەوە کە پەیوەندی بە ئاینو یاساوە هەبێت چونکە ئەوەی دەستی بەسەر کۆشکدا گرتبوو ـ کە بریتی بە لە عەقلیەتو دەروونی سولتانو بەڕێوەبردنو کارگێڕی بریتی بوون لەو کەسانەی هەمیشە هەوڵی ئەوەیان بوو لە نێوان سولتانو پیاوچاکانو دڵسۆزانو ئاینپەروەراندا هیچ جۆرە پەیوەندیەك نەبێت ، دیوارێکی پۆڵاینیان لە چوار دەوری کۆشکدا دروست کرد بوو تا بە هیچ جۆرێك بۆنێکی خۆش یان شنەیەکی پاكو گوڵاوی نەیگاتێ .

بەڵام باری ژیان هەر بەم جۆرە نەمایەوە ، پاش ئەوەی سولتان جیهانگیر جڵەوی فەرمان ڕەوای گرتە دەست لە ساڵی ١٠١٤ی کۆچی .

سەرەڕای ئەوەی کە جیهانگیر بە هۆی فێرکردنو پەروەردەکردنی باوکیەوە پیاوچاکو ئاینپەروەر دەرنەچوو بوو ، خۆی بەشەریعەتی ئیسلامەوە نەبەستبۆوەو گوێشی بە ئەرکو فەرمانەکانی ئاین نەدەداو لەگەڵ ئەوەشدا لە ناخیەوە هیچ جۆرە ڕقو کینەیەکی بەرابەر بە ئیسلام هەڵنەگرتبوو ، دەمارگیری بۆ هیچ لایەنێك تێدا نەبوو ، خاوەن هیچ فەلسەفەو مەزهەبێکی ئاینی نەبوو ، هیچ جۆرە ئارەزوویەکی لە بڵاوکردنەوەی ئاینو یاسا نوێکەی باوکی نەبوو بە کورتیەکەی نە ئەوەبوو دەماری ئیسلامی تێدا بێتو هەوڵی پاراستنی بدات ، نەئەوە بوو دژی بوەستێو بیەوێ تەفرو تونای بکات •

ئەو سوڵتانانەی کە هەر خەریکی ڕابواردنو سەرگەرمی یاریکردنو خۆش گوزەرانینو حەزیان لە ژیانی نەرمو نیانی‌یە ئەمانە بە شێوەیەکی تایبەتی گوێ نادەنە لابردنی ڕژێمی باو و دانانی ڕژێمێکی تری نوێ لە جێگەکەیدا ، بەڵکو هەموو غەمو پەژارەیان لە بەسەربردنی ژیانێکی پڕ لە ڕابواردنو ئاهەنگی شەوانەو شەوگار بەسەر بردن دەڕەوێنەوە ، ئەم جۆرە کەسانە لە ناخیانەوە ئەو جەشنە کەسانەیان بەدڵەو لە لایان بەڕێزەو مەزنە کە خۆیان دوور دەگرن لەم بەزمو ڕەزمانەو گوێی نادەنێو لە پلەو پایەی کورسی دوورە پەرێزی دەکەن ، تا ئەمانە ئامادەیی‌یان زۆر زۆرترە بۆ حەق ماف لێوەرگرتن ، وەك لەو کەسانەی کە بانگەوازی بزووتنەوەیەك دەکەنو دەیانەوێ فەلسەفەیەکی نوێ دامەزرێنن ، یان ناویان لە ناو پەڕاوی مێژوودا تۆمار بکەنو ناوبانگ لە ناو خەڵکیدا پەیدا بکەن وەکو دامەزرێنەری ڕێبازێك یان داهێنەری مەزهەبێکی تایبەتی[1] •

---

(۱) موسلمانان لە هەموو سەردەمێکدا دەبێ وریای ئەم جۆرە فەرمانڕەوایانە بن •

## کام بەرنامەیە ڕاستە :ـ

( لەو کاتەدا لە بەردەمی ئیمامی سەرهەندیو هەموو ئەو زانا دڵ سوتاوانەی ئیسلام کــــە هەموویان بە زانستی ئاینیو چاکی دەروونیو ڕەوشت بەرزی خۆیان ڕازاند بۆوەو ، غیرەتی ئیسلامی لە دڵیاندا قوڵپی دەداو جۆشی سەندبوو ، سێ ڕێـگا هەبوو تا بتوانن لێیەوە بەرەو ڕووی تەوژمی ئـەو بارو دۆخە بنەوە کە سەرتاپای وڵاتی تەنی بۆوە .. ئەو ڕێـگایانەش ئەمانە بوون :

(١) دەست بەرداری وڵاتو فەرمان ڕەوا بنو جڵەوی بۆ شـــــل بـکەنو پەنابەرنە بـــەر کونجێکو بە زیکری خواو پەروەردەکردنی قوتابیانو ڕێنمایی سۆفیانەوە خەریك بنو لەناو خواپەرستیو پەرستشدا خۆیان بتوێننەوە .. ئەم ڕێبازە یەکێك بووە لەو ڕێبازانەی لــە سەردەمی ئیمامی سەرهەندیدا بە دەیان بەڵـکو بە سەدان لە زاناو شێخەکان هەڵیان بژاردبووو ، لە هەموو لایەکەوە تەکیەو خانەقایان دروست کرد بوو بـــە بێدەنـگی خەریـکی پەروەردەکردنو ڕێنمایی بوون ، خەڵکی دەچوونە لایانو سودی ڕۆحیو ئیمانیان لێ وەردەگرتن .

(٢) ڕێبازی دووەم کە هەندێکی تر هەڵیان بژارد بوو ، ئـەوە بوو بە تەواوەتی هیوا بـڕاو بوو بـــوون لە چـاك بوونی ســوڵتانو دەســـتو پێوەندەکەی ، ئەو سوڵتانەی هەر بە ناو دەچێتەوە سەر خێزانێکی ئیسلامی بە دوژمنێکی کەللە ڕەقی ئیسلام دەهاتە پێش چاویان ، بەڵگەشیان هەموو ئەو یاساو دروشمانەی پاشایەتیو خوو و ڕەوشتانەیەتی دەینواند،ئەمە وای لێکردن بە تەواوەتی بێ هیوا بنو ، پەنا بەرنە بەر دروست کـــردنی

بەرەیەکی ئاینی دژ بە دەوڵەتو سوڵتانو دژیان بجەنگنو خەباتێکی بەردەوام بکەن بۆ ئەم مەبەستە ، لەو ڕوانگەیەوە بۆی چوون کە هەرە دوژمنی گەورەی ئیسلامو ئاینە ) [1] .

(جا ئەمانە هەوڵی ئەوەیان دا کە ئەو کەسانەی غیرەتی ئیسلامیان تیدایەو هەستو سۆزی جیهادو خەبات کردن لە ڕێناوی خوادا لە دەروونیانا جۆشی خواردووە لە دەوری خۆیان کۆبکەنەوەو ئەمجا شۆڕشێك لە وڵاتدا بەرپا بکەنو بە کاروباری ڕامیاریو سوپایی ( السیاسی والعسکری ) ئەم مەبەستەیان جێبەجێ بکەن ، تاوەکو فەرمان ڕەوای وڵات بدەنەوە دەست پیاوچاکێکی ئاین پەروەرو بارو دۆخی دەورووبەری بگۆڕن بێ ئەوەی بیر لە ئەنجامی ئەم مەبەستو خەباتکردنەیان بکەنەوەو تاچ ڕادەیەك دەگونجێ لەگەڵ سەردەمو زروفو شەرعدا .

(٣) ڕێبازی سێیەم بۆ چارەسەرکردنی ئەو گیروگرفتانەو گێڕانەوەی ڕۆحی ئیسلام ، بریتی بوو لەوەی پەیوەندی لەگەڵ ئەندامانی دەوڵەتو بەڕێوەبەرانی وڵاتدا ببەسترێتو دەماری ئیسلامیو سۆزی ئاینیان تێدا بجوڵێنرێ ، ئەو کەسانەیان کە چاك دەیانناسنو لەکاتی خۆیدا پەیوەندیان لەگەڵیاندا بووەو باوەڕیان بە ئیخلاصو بەرزی کەسێتیو ڕەوشت بەرزیان هەیەو ئاگایان لەوە بێت کە ئەمانە دڵیان بۆ ئەم بارە نالەبارە لە ئازارو ئەشکەنجەدایە تا ئەو خۆڵەمێشەی پشکۆی ئیمانی داپۆشیوە بتەکێنرێو سەر لە نوێ فووی پێدا بکرێتەوەو بڵێسەی دەرونیان هەڵگیرسێو سەر لە نوێ گڵپە بسێنێو ئەمجا هانیان بدرێت بۆ ئامۆژگاری کردنی سوڵتانو سەرابەردەو دەستو پێوەندەکەی

---

(١) هەمان سەرچاوە .

تلوەکو ئەو غیرەتە ئیسلامییە لە باب و باپیرانەوە بۆیان ماوەتەوە سەر لەنوێ بەهێزێ و بکەونەوە جوڵەو ، یان گەیێتەوە حاڵەتێکی وا ، پارێزگاری ئیسلام بکەن و چارەسەری ئەو دڵە بریندارانە بکەن کە چەرمەسەری و نالەباری ئەو سەردەمە برینداری کردووە ، جا ئیتر خۆشیان وا پاك و خاوێن بکەنەوە لە ناخەوە کە هەرگیز گوێ بە پلەو پایەو کورسی نەدەن و زوهدو خوداناس بن بۆ خەڵکی و دەوڵەتی بسەلمێنن کە مەبەستیان دنیاو کورسی و پلەو پایە نیەو هیچ کاتێك خۆیان نەخەنە جێی گومانەوەو سەرنجی خەڵکی ڕابکێشن و زیانێکی زۆریش لە پەیامەکەیان بدەن و ئەمجا خەڵکی لێ بتەکێنەوە وەکو ئیمامی عومەر خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموێ ( من عرض نفسه للتهمة فلا يلومن من أساء به الظن ) ٠٠ واتە هەر کەسێ خۆی خستە بارێکی واوە کە تومەتی بخرێتە پاڵ و گومانی لێ بکرێت لۆمەی ئەو کەسە نەکات کە (ظنی) خراپی لێدەکات چونکە خۆی بە دەستی خۆی خۆی خستۆتە ئەو شوێنە گومان لێ کراوەوە ٠٠ کەواتە دەبێ خۆی وا بپارێزێ کە بەهێزترین کەس و زۆرزانترینیان لە پیلان گێڕاندا نەتوانێ تۆمەتی دونیا پەرستی ، یان مەبەستی ڕامیاری ، بداتە پاڵیانەوەو هیچ جۆرە پیلانێك نەتوانێ لە شان و باهۆیان کەم بکاتەوەو لەناو خەڵکیدا شەرمەزار بن ٠

جارێ ڕێگای یەکەم لەگەڵ سروشت و دڵ و دەروونی ئیمامو بەرزی هیمەتی و بەهێزی عەزیمەتی و مەزنی پلەو پایەکەی کە خودا پێی بەخشیوە نەدەگونجا ٠٠ ئیمام سەرەڕەندی پاش ئەوەی کە تەواوکردن و پێگەیشتنی دەروونی و ، پەروەردەیەکی ڕۆحی بەرزی بە دەست هێنا ، گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە خوای گەورە بۆ کارێکی

مەزن ئامادەی کردووە ، ئەوە تێ گەیشتبوو خوای گەورە بەتەنها بۆ پەرستنی تاکی‌و ، بڕینی قۆناغەکانی ڕۆحی دروستی نەکردووە ، یان بۆ شێخایەتی‌و تەریقەت‌و ، ڕێنمایی سۆفیەکان ئامادەی نەکردووە ، هەر لەبەر ئەمە بوو نهێنی‌یەکانی خۆی ئاشکرا دەکردو لە بابەت خۆیەوە دواوە ، جا باسی وتەی یەکێك لە شێخە گەورەکان دەکات ئەویش شێخ ( عبداللّه احرار ) بوو ۸۹۵ك کە شێخێکی پایە بەرزو لە شێخەکانی نەقشبەندی بوو بەڵکو یەکێکە لە پێشەوایانی زنجیرەی نەقشبەندی ، ئیمام دەڵێ :

**شێخ عبیداللّه وتویەتی :**

( ئەگەر پەلاماری شێخایەتی‌و ئیرشادم بدایەو ، بەیعەتم لەگەڵ خەڵکیدا بەستایە ، ئەو کاتە شێخێك لە شێخەکانی تری تەریقەت کەسی دەست نەدەکەوت بەیعەتی لەگەڵدا بەستێت‌و تێکەڵاوی مریدەکانی بێت ، بەڵام خوای گەورە کارێکی تری پێسپاردوم ئەویش بڵاوکردنەوەی شەریعەتی پیرۆزو ، لایەنگیری میللەتی ئیسلامە ) .

**ئیمام سەرهەندی لەسەر ئەم وتەیە دەڵێ :**

( « شێخ عبداللّه وەختی خۆی دەچووە لای سوڵتانەکان‌و لە لای کوڕەکانیادا دادەنیشت‌و بەهێزی دەروونی کاری تێ دەکردن ، ئەوانیش شوێنی دەکەوتن‌و گوێڕایەڵیان دەکردو ، ئەمجا پشتی پێ دەبەستن بۆ بڵاوکردنەوەی شەریعەت » .

بەڵام ڕێگەی دووەم ، ئەو کەسانە دەیگرنە بەر کە خاوەنی عەقلیەتێکی سیاسی‌و کورت بین‌و لێکدانەوەیەکی سنوردارن ، هەر لە

سەرەتاوە هەوڵو خەباتەکەی بە گومانو ظەنی خراپەوە دەست پێ دەکات ، تا وا لە حکومەت دەکەن ـ بەو پەلە پەلو هەڵشەیی یەوە دروستکردنی بەرەیەکی دژ بە میریو فەزڵدانی ئەم لایەنە بەسەر لایەنی حیکمەتی بانگەوازییو ، سۆزی چاککردنو ئامۆژگاری ـ کە خێرا بەرامبەری بوەستێو ڕوو بەڕووی یەکتر ببنەوەو هەر لە سەرەتای ڕێنگاوە ڕێی لێ دەگرێتو تەماشای تازە دەرهاتوو پانو پلیش دەکاتەوە ، بێ ئەوەی هێشتا بەرێکی گرتبێ ، ئەمیش بەم کارەی سەرزەوی بەو هەموو فراوانی یەوە لە خۆی تەسك دەکاتەوەو جێ بەخۆی ناگرێت . لە ڕاستی دا ئەم جۆرە ڕێبازە ڕێڕەوی ئەو بانگکەرە سەرکەوتووە نیە کە بۆ خۆیو شوێن کەوتوانو کۆمەڵەکەی هیچ جۆرە بەرزیەکو ناو دەرکردنێکی ناوێو مەبەستیشی زاڵ بوون نیە بەسەر حوکمو فەرمان ڕەوادا ، بەڵکو هەموو غەمو بەزارەی بریتی یە لە دەرخستنی ئاینو جێبەجێ کردنی ئەحکامەکانی شەریعەتو چاك بوونی دەوڵەت جائیتر جێبەجێکەری ئەو ئەحکامانە هەر کەسێك بێت(١).

ئەوەتا تێکۆشەرانو دڵسۆزانی ئیسلام لە سەدەی بیستەمدا هەمان ڕاو بۆچونیان هەیە لەم بارەیەوە ، یەکێك لەوانە شێخ عومەر تەلمەسانی یە دەڵێ و پڕ بەدەم هاوار دەکات : ڕێبازەکەمان هەرگیز داوای حوکم ناکات لەبەر حوکمکردن ، خواش لەسەر ئەمە شایەتە . ئێمە دەمانەوێ حوکم چاك بێت نەك حاکم بگۆڕرێتو هیچ پەیوەندی یەکمان بەحاکمەوە نیە(٢) ... هەر لە هەمان وتاردا دەڵێ

---

(٢) گۆڤاری ( اليوم السابع ) ژمارە ١٠٩/حزيران ١٩٨٦ وتارەکە لەژێر سەردێری ( نريد اصلاح الحكم لا تغيير الحاكم ) .

(١) رجال الفكر والدعوة / ابو الحسن الندوي .

« ئیمە بە لامانەوە گرنگ نیە کێ حوکم دەکات ، بەڵام پێویستە لە سەری تەتیقی شەریعەتی ئیسلام بکات ، ئیمەش ناسانەوێت زۆرانبازی لەگەڵ کەسدا بکەین ، پێویستە خەڵکی تێ بگەن هیچ ڕێگایەك نیە بۆ بەگژا چوونی حاکمو مەحکوم چونکە ئەوەی سوود وەردەگرێت لەم بەگژاچوونەدا تەنها دوژمنانی گەلو فەرمان ڕەوایانن.

من خۆم ئامۆژگاری ئەوە دەکەم کە لە دەروونی هەموو لاوێکدا ئەوەی تێدا بچێنرێ نەچێت بەگژ فەرمان ڕەوادا ، پێش ئەوەی هەڵەی فەرمانڕەوایان بگرێت یا لە پێشاندا هەڵەی خۆی بگرێتەو یا یەکەم جار بە خۆیدا بچێتەوە »(١) .

چونکە بە دروستکردنی بەرەیەکی دژ بە دەوڵەتو جەنگاندن دژی ، پڕە لە مەترسیو چەرمەسەری بێ ئەوەی ئەنجامێکی چاكو سودێکی موسڵمانانی تێدا بێت تەنها خوێن ڕشتنەو هیچی تر ..

( جا ئەم جۆرە هەنگاونانە لەو کاتەی باری ڕامیاری باوی وڵاتدا جۆرێك بوو لە لەناوچوونی مافی ئیسلام ، چونکە دەوڵەتی مەغۆلی کە سوڵتان (بابر) پایەکانی داکوتاوەو قایمی کردووەو ڕەگەکانی بە دەستی خۆی چاندووەو پاراستویەتیو مەلیك (هماویون) ئەو گەشتە دوورو درێژی لە پێناویدا چەشتووەو مەلیك ئەکبەر توانیویەتی لە ڕێگەی شەڕو شۆڕو جەنگانەوە دای مەزرێنێو ئەوەندەی تر بەهێزی بکات ، بۆیە ژێر دەست خستنی وڵات کە هێشتا لە هەرەتی لاوێتی دایەو توندو تۆڵەو ، شوێنەواری لاوازیو پیرێتی تێدا دەرنەکەوتبێ وڵاتێك کە سوڵتان ( سەلیم شاە ) جێنشینی مەلیك ( العصامی سوڵتان

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو .

شیر شاه السوری ) بۆی نەڕوخاین‌و چەندانی تر ئەو هەوڵەیان دلوە بۆ ڕووخاندنی ڕژێمی حوکم‌و هەموو هەوڵەکەیان بەزایە چوو ، خۆشیان لەناو چـــوون •

ئەم چەشنە تاقی‌کردنەوانە هەموویان سەرکوت کران ، بۆ نموونە لـە سەردەمی سوڵتان ئەکبەردا بزوتنەوەی ئاینی زۆر سەری هەڵداو ، هەروەها ڕێـکخراوێـکی گەورە بە پێشەوایەتی شێخ بایەزید دەرکەوت بە ناوی ( کۆمەڵەی ڕۆشنایی ) ، ئەم کۆمەڵە بە درێژایی چەندین ســاڵ جەنـگا دژی سوپای دەوڵەتی مەغۆلی ، چەندین ناوچەو جێگایان گرت چەندین سەرکردەو سوپای سوڵتانیان شکاند ، ئەم شەڕو شۆڕو کوشتارە هـەروا بەردەوام بوو ، دەوڵەت نەیدەتوانی کۆتایی پێ بهێنێ ، تا لـــە سەردەمی سوڵتان شاهجهاندا بە تەواوەتی بەسەریدا زاڵ بوون‌و ئـــەو شۆڕشەیان کوژاندەوە ، سەرەڕای ئەمانەش شۆڕشەکە جــگە لـــە شڵەژاندن‌و ئاژاوە زیاتر هیچی تری بە ئەنجام نەهێنا ، تا لـە ئاکـــامدا هەموویان تەسلیمی دەوڵەت بوونەوە • چونـکە هەوڵدانی عەسـکەری‌و شۆڕش هەڵگیرساندن بە ناوی چاکردنی باری خراپ‌و تێک‌چوو دەبێتـە هۆی پەیداکردنی ظەنی خراپ‌و گومان بردن بەرامبەریان لـــە لایەن خـاوەن سوڵتەو فەرمان ڕەوایانەوە ئەو کاتە بە هەموو توانایەکیانەوە هەوڵ دەدەن ـ بۆ لەناوبردن‌و ڕیشەکێش کردنی ئاین‌و شوێن کەوتوانی ئاین‌و ، ئاین پەروەران یەکە یەکە هەموویان لە ناو دەبەن‌و بە چەشنێکی سەرتاپاگیری هەموویان سەرکوت دەکەن •• جا لەوانەیــە ئیمـامی سەرهەندی هەر لەبەر ئەم هۆیە بوو بێ داوای لە وەزیری ســـوڵتان جیهانگیر ( میر مهابت خان ) کرد کاتێ کە شۆڕشی بەرپاکرد لە ساڵی

١٠٣٥ك دژی دەوڵەت ، وازبێنێ‌و تازاوە نەبێتەوە ، ئەمە لە ڕاستی‌دا بەڵگەیەکی زۆر ڕوونە لەسەر پێشینی ئیمامی سەرهەندی‌و ئەو یارمەتیە خوایی‌یەی کە هەمیشە لەگەڵیدا بووە ، چونکە ئەو ڕێگا گوماندارو پڕ لەمەترسی‌یەی نەگرتە بەر بۆ ڕووداتی گۆڕانکاریەکی لەڕەگ‌و ڕیشەی ئەو زروف‌و وەزعە ، بەڵکو ڕێگای بیناکردن‌و ئیجابی لە جیاتی ڕوخێنەرو سەلبی گرتەبەر ، ڕوو وەرچەرخاندن‌و ئاراستەکردنی کۆمەڵی کردە بەرنامە لە جیاتی لەناوبردنیان (١) .

ئەمجا پاش ئەوەی کە ئەم فیکرەو بەرنامەیە لە مێشك‌و دڵ‌و دەروونی ئیمامدا بە تەواوەتی گلۆڵەی کرد گەیشتە قەناعەت جگە لەم ڕێگەیە هیچی تر نایان گەیەنێتە ڕۆخی ئیمان‌و ئاشتی‌و ئاسایش ئیتر دەستی بەکارە نوێکاریەکەی کرد(١) ، لە سەرەتادا ئەوەی کە پێویست بوو دروست کردنی پەیوەندی تایبەتی بوو لەگەڵ ئەو موسڵمانانەی کە بەڕێوەبەران‌و کارگێڕانی دەوڵەتن ، جا ئیمامی سەرهەندی بەهۆی زیرەکی‌و دەروون خاوێنی‌یەوە زۆر چاك دەروونەکانی دەناسی‌و لێیان تێ‌دەگەیشت ، بەو پێیە لەگەڵیاندا پەیوەندی دەبەست‌و قسەی لەگەڵ دەکردن لەسەر ئەو ڕێسایەی کە دەڵێ ( كلّم الناس على قدر عقولهم ) لە ڕاستیدا ئەم ڕێسایە هەر بەوەندەوە نەوەستاوە کە قسە لەگەڵ تاکە کەسێك بکرێت بە پێی ئاستی ئەقڵ‌و تێگەیشتی بەڵکو مەبەستەکەی ئەقڵی کۆمەڵێك‌و ئەقڵی سەردەمێکیش دەگرێتەوە چونکە ئەقڵی هیچ کۆمەڵێك لە کۆمەڵێکی تر ناچێت‌و ئەقڵی هیچ سەردەمێك وەکو سەردەمێکی تر نیە هەرچەندە

---

(١) رجال الفكر والدعوة / ابو الحسن الندوي .

له شتی گشتی لەوانەیە لەیەك بچن بەڵام لە زۆر لایەنی ترەوە لە یەكتر جیاوازن .. بۆیە دەبێ مرۆڤی ئاقڵو هۆشیار پێش ئەوەی بانگەوازەكەی دەست پێبكات ئاستی ئەقڵو ڕۆشنبیری كۆمەڵو سەردەمەكەی خۆی بزانێتو هەڵی سەنگێنێت ئەمجا بەو ئاستەوە دەست بە كارەكەی بكات ..
لە ڕاستیدا ئیمام دەورێكی زۆر جوانو كاریگەری دی لەم پەیوەندی دروست كردنەدا ، خۆ هەر تەنها پەیوەندی لەگەڵ كاربەدەستاندا نەبەست بەڵكو لە ناو كۆمەڵەكەی خۆیدا ژیاوەو زۆر چاك دەیانناسیو ئەوانیش ئەم دەناسنو پەیوەندی بە زۆربەیانەوە هەبوو بە ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ لە ڕێگەی كەسانی ترەوە .

بەڵێ پەیوەندی بەستن چەند فرمانو ئامانجێكی تێدایە ئەگەر تیایدا نەبێت ئەوە پەیوەندی بەستن نیە بە خەڵكیەوە ، ئەو ئامانجانەش ئەمانەن(1) :ـ

(١) زانین گەیاندن لە گوێزانەوەی زانیاریو شارەزاییو بیرو ڕا بۆ كەسانی تر خۆی دەنوێنێ ، بە مەبەستی ووریاكردنەوەیانو ڕووناك كردنەوەی هۆشیانو ، بەرزكردنەوەی ئاستی فیكریو عەقیدەییو كرداریان ، گونجاندنی هەڵوێستیان بەرامبەر بە ڕووداو بەسەرهاتی كۆمەڵایەتی نوێو دروستكردنی شارەزایی پێویست تیایاندا .

(٢) فرمانی قایل كردن : مەبەست لەم پەیوەندی بەستنە ڕوودانی گۆڕانكاریەك لە ڕوانگەو بۆچوونی كۆمەڵ دەربارەی ڕووداوێك یان چەند ڕووداوێكی تر یان فیكرەیەك یان كۆمەڵە فیكرەیەكی تر .

---

(1) الاتصال والتغير الثقافي/هادي نعمان الهيتي/الموسوعة الصغيرة ٢٣

(٣) داپێن کردنی هلوبەشی ڕۆشنیری : بریتی‌یە لە گوێزانەوەی ڕۆشنیری لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر ، وە لە کۆمەڵێکەوە بۆ کۆمەڵێکی تر ، لەگەڵ چاك کردنی‌و خستنە سەری ، بۆ گونجاندنی لەگەڵ ئامانجە نوێیەکانی کۆمەڵ . جا پەیوەندی بەستن هەمیشە بریتی‌یە لە دروستکردنی پەیوەندیەکی کۆمەڵایەتی نوێ ، لە کاتی پەیوەندی بەستنی کەسێك لەگەڵ کەسێکی تردا ، یان کۆمەڵێك لەگەڵ کۆمەڵێکی تردا ، یان نەوەیەك لەگەڵ نەوەیەکی تردا، ئەوە بە هەر شێوەیەك بووە پەیوەندی لە نێوانیان پەیدا دەبێت ، لە ئاکامی ئەمەشدا هاوبەشی لە ڕاو بۆچوونو بیروباوەڕو ئامانجیشدا دروست دەبێت ، ئەمجا ئەوەیان بۆ ئامادە دەبێت کە لەگەڵ واقیعەکەیاندا کارلێکردن پەیدا بێت تاوەکو بزووتنەوەو گۆڕانکاری خۆیان دەست پێ بکەن .

لەبەر ئەوە پەیوەندی بەستن تەنها هۆیەك نیە بۆ دەنگ‌و باس گەیاندن‌و گوێزانەوەی بیروڕا ، بەڵکو ئامێرێکە بۆ پێك هێنانی ڕۆشنیری کۆمەڵ‌و بەرزکردنەوەی ئاستیان‌و دروستکردنی کەسێتی تاك‌و کۆمەڵ . پێش‌خستن‌و پەرەپێدانی توانستی مرۆڤ‌و گەشەو نمش‌و نماکردنی هەستی لێ پرسراوی تیایاندا‌و ، زیندوکردنەوەی گیانی نیش‌کردن‌و بەدەست‌هێنانی شێوازی ڕەفتارو ئاکاری وا کە بگونجێ لەگەڵ پێویستی‌یە نوێیەکانی ژیانی سەردەم[1] .

بەڵێ ئیمامی سەرهەندی هەر لەسەر ئەم بنەمایانە بوو هەستا بە پەیوەندی بەستن بە کۆمەڵەکەی‌و کارگێڕو کاربەدەستانی وڵاتەکەی تا بتوانێ لەم ڕێگەیەوە ئەوەی پێ‌بەنی بگەیێنێ ، چونکە کرداری

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو .

گوێزانەوەو ، وەرگرتنی حەقیقەتو ڕاو فیکرەو ماناو شارەزایی‌و ئەزمون‌و هەست‌و نەست‌و ڕوانگەو ڕێگەی جیاوازی گەیاندن ، لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی ترو لە کۆمەڵێکەوە بۆ کۆمەڵێکی ترو لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر ، لە ڕێگەی پەیوەندی بەستنەوە دەکرێت ..

هەر بەم جەشنە ئیمام پەیوەندی بەو کەسانەوە دەبەست کە بۆ ئیسلام دڵ سوتاون‌و ناتوانن هیچ بکەن ، چونکە ئەو پیاوانەی سەردەمی سوڵتان ئەکبەر هەرگیز دڵ خۆش نەبوون بەو کردەوانەی ئەکبەرو زۆریشیان پێ ناخۆش بوو ، بەڵام ئەوەندە بوو کە بێدەسەڵات بوون‌و هیچیان پێنەکراوە ، هەندێکیان لە ناخیانەوە ئیسلامیان خۆش دەویست‌و دەماری ئاینی تیایاندا جۆشی دەسەند ، هەندێکی تریان ئیمام‌و شێخ (عبدالباقي) ڕابەریشیان دەناسی‌و خۆشیان دەویستن‌و باوەڕیان بە پایە بەرزی ئەو هەبوو ، هەرچەندە مریدی ئەو نەبوون‌و ، بەیعەتیان لەسەر دەستی نەبەستبوو ، بەڵام ئیخلاصی ئیمامی سەرهەندیان دەزانی تاج ڕادەیەکەو ، دەیانزانی چۆن بۆ ئیسلام دەسوتێ‌و دڵ پڕ لە ئازارەو ئاگایان لە زوهدو خاوێنی ئیمام هەبوو .

بەناوبانگترین ئەو پیاوانەی دەوڵەت کە ئیمام پەیوەندی پێوە بەستن ئەمانە بوون :

(١) السيد المرتضى کە بە شێخ فەرید ناسرابوو .
(٢) خان اعظم مرزا کوکە .
(٣) خان جهان اللودهي .
(٤) حیدر جهان البهانوي .
(٥) الأله بيك جهانگير .

## ئەوەی لە دڵەوە دەرچێت لە دڵدا جێگیر دەبێت :ــ

ئیمام سەرهەندی ، ڕووی دەمــی کردە پیاوانی دەوڵەتو میرو وەزیران ، پەیتا پەیتا نامەی بۆ دەناردنو پەیوەندی لەگەڵدا دەبەستن ، جگە لەو پەیوەندیەی کە لەگەڵ خەڵــکی ڕەشۆك دروستی کردبوو پیاوچاكو قوتابیو مریدی زۆری لە دەور کۆبووبۆوە ، بە گشتی ئیمام کەناڵی پەیوەندیەکانی بۆ هەموو لایەك نارد بوو و ، ســــەری پەتی زۆربەی لایەنەکانی وڵاتی لە مستی خۆیدا کۆکردبۆوە ، پارچەکانــی دڵی لەت لەتکراوی بە هەموو لایەکدا بڵاوکردەوە ، زاتی خۆی بەسەر بەڕەی نامەکانیدا دابەش کرد ، ئەو نامانەی ڕەوانبێژیەکی تـــەواوی بەخۆیەوە گرتبوو ، جوانی شێوازو کاریگەریەکی بەهێزو پێزی تێــدا بوو ، لەهەر یەکێکیاندا کانی پڕ لە مانا هەڵدەقوڵا ، بە ئاشکرا ئازارەکانیو دڵسۆزی خۆی بەرامبەر بەو واقعو بارە نالەبارە دەردەخست .. بـــە چاکترین شێوە لە بارو وەزعی ئەو سەردەمە تێت دەگەیێنێ ، تا ئێستاش کــە ســەدان ساڵی بەسەردا تێپەڕیوە هەمان کاریگەرو جوانــکاریو ڕەوانبێژی تێــدا دەبینرێت ، خوێنەر زۆر چاك تێدەگات ئەو نامــانەی بۆ ئەو کەسانەی نێراون تا چ ڕادەیەك کاریگەر بوون . لە ڕاستیدا ئــەو نامانە لە ڕاگەیاندنو بانگەوازەکەیدا نێرراو نوێنەری ئیمام خۆی بوون تەرجومانی تەواوی دڵە برینــدارو پڕ لــە ئازارەکەی بــوون ، دڵۆپــی فرمێــسکەکانی بوون ، پارچەکانی جــگەری بوون ، هۆیەکی بنــەڕەتی پەیوەندیەکانی بوون کە کاریگەریەکی تەواوی بوو لە ڕوودانی ئــەو

کۆدیتا مەزنەی لە دەوڵەتی مەغۆلیدا لە سەدەی دەیەم لـــە هیندستاندا ڕویـــدا(١) .

ئیمـــام ژمارەیەکی زۆری لەو نامانە بۆ میر ( السید الفرید )(٢) نارد ، خاوەنی پلەو پایەیەکی بەرز بوو لە کارگێڕی دەوڵەتو بەڕێوە بردنی وڵاتدا ، هەروەها لە سەردەمی سوڵتان ئەکبەردا پاوێژکارێکی تایەتی فەرمانڕەوایی بوو .. ئـــەم پیاوە ، شێخ (عبدالباقی) ڕابـەری ئیمامی زۆر خۆش دەویست ، ڕێزو شکۆدارییەکی تەواوی بۆ هەبوو ، بۆیە ئیمـام ئەم دەماره ئایینیو دینداریەی بەهەل زانیو هـانی دەدا بۆ بەجێهێنانی ئەو ئەرکە ئایینییەی بەسەر شانیەوەیەتی ..

جگە لەوەش کە سەر بە ئالەو بەیتی پێغەمبەرە صلی الله علیە وسلم هانی بۆ ئەوە دەدا ئامۆژگاری سوڵتان (جیهانگیر) بکاتو یارمەتی بدات بۆ گۆڕینی ڕێڕەوی دەوڵەت هـــەر لە سەردەمی مەلیك ئەکبەرەوە لەسەری دەڕۆن ، هەوڵی دەدا لە خەوی غەفڵەت بە ئاگای بهێنێتەوەو پێویستیو فەرمانەکانی ئیسلام جێبەجێ بـکاتو ئـــەو غەریبییەی ئیسلامو موسڵمـــانان دەیچێژن بگۆڕێت بەمەزن گرتنی دروشمـــە پیرۆزەکانی ئاینو پارێزگاریکردنی خـــاوێنی ئیسلام ، ڕێزگرتنی ئەحکامە شەرعییەکانو فەرمایشتەکانی پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم .

ئیمـــام سەرهەندی لە یەکێك لەو نامانەی بۆ ( السید الفرید)ی ناردووە پاش دانیشتنی جیهانگیر لەسەر تەختی پاشایەتی دەڵێ :ـ

---

(١) مەبەستی کۆدیتای ڕۆشنبیریو فیکریو عەقیدەیە .

(٢) الامیر الکبیر مرتضی بن احمد ابی بکر النجاری المعروف بنـــواب فرید الدین .

( سوڵتان له دنیادا ، وەکو دڵ وایه لەناو لەشدا ، ئەگەر دڵ چاك بوو لەشیش چاك دەبێ ، ئەگەر دڵ خراپ بێ ، ئەوا لەشیش تێك دەچێ، چاکی سوڵتان ، چاکی دنیایەو خـــرابی سوڵتان هۆی تێـك چوونـی دنیـــایه )(۱) •

خۆتان زۆر چاك دەزانن ، له سەردەمی سوڵتان (ئەکبەر)دا ، چ نەگبەتیو چەرمەسەریەك بەسەر ئیسلامدا هات ، هەرچەندە ئیسلام له سەدەکانی پێشوودا غەریب بوو • بەڵام هەرگیز وا زەلیلو بێ نرخ نەبووە ، وەکو ئەوەی لەو چەرخەدا بەسەری هاتووە ، چونـکه لەو سەدانەی که تێپەڕی کـافر دەستی بـــه کوفری خۆیەو گرتبوو ، ـ موسڵمانیش دەستی به ئیسلامی خۆیەوە گرتبوو ( لـکم دینکم ولي دين) بەڵام له سەردەمی ( ئەکبەر )دا ئەهلی کوفر بەسەر موسڵماناندا زاڵ بوونو به ئاشکرا دەستیان کرد به جێبەجێکردنی ئەحکامەکانی کوفر له خانەی موسڵماناندا ، بەڕادەیەك موسڵمانان نەیان دەتوانی ئاینەکەیان ئاشکرا بـکەن ، هەر کەسێ بوێرایه ئاینەکەی ئاشکرا بـکات خیـرا سزا دەدراو فەرمانی خنکاندنی بۆ دەردەکرا •

هاوارو ماڵ وێرانیو نەگبەتی خۆمان ، ئاخو داخ بۆمـــان • • شوێن کـــەوتووانی محمد صلى الله عليه وسلم کــــه خۆشـەویستی پەروەردگارە زەلیلو بێ هێزو بێ نرخ بن بێ باوەڕانو دوژمنـــانی پێغەمبەرێتی ســـەر بەرزو بەهێزو ڕێزلێ گیراو بن ، موسڵمانان به دڵـه پڕ له ئازارو برینداره‌کەیان بۆ ئیسلام دەگریانو کافرانو بێ باوەڕان

(۱) مەبەست تێك چوونی دیوی دەرەوەو ڕواڵەته که تێك دەچێت دەنا، ئاخو دڵو دەروونی مرۆڤ پەروەردەکردنو عەقیدەو باوەڕ بــه قەناعەتەوە چـــاکی دەکات •

گاڵتەیان پێ دەکەن‌و بڕینیان دەکوڵێننەوە ، خۆری هیدایەت لە ناو تاریکی گومڕایدا ئاوا بوو ، نوری ڕاستی بە پەردەو هەوری ڕەشی ناهـــقی بەری لێ گیراو دیار نەمـــا بوو .

بەڵام ئیمڕۆ مادام ئەوەی کە ڕێی لە پێش کـــەوتنی ئیـــسلام گرتبوو و ، نەیدەهێشت سەرکەوێت نەماوەو لەناو چووەو ، بە مژدەی هاتنی سوڵتانی ئیسلام بۆ سەر تەختی پاشـــایەتی گوێی خەڵـــکی زرینگاوەتەوە ، بۆیە پێویستە لەسەر موسلمانان یارمەتی سوڵتان بدەن‌و سەری بخەن ، ڕێـگای بڵاوکردنەوەی شەریعەت‌و لایەنگیری میللەتی ئیـسلامی بۆ نیشان بدەن ، جا ئەو یارمەتیدانە بە دەست بێت یان بـــە زبـــان(1) .

پاشان ئەو دەردەی لە ڕابوردودا توشیان هاتووە دەست نیشـــانی دەکـــات‌و دەڵێ :ـ

هـەر نەگبـەتی‌و بەڵایەك كە توشی ئیـسلام هاتووە لە ڕابوردودا هەمووی بەهۆی خراپەکاری زاناپانی خراپەوە بووە ، ئەوان سوڵتانیان گومڕا کردو هەڵیان خەڵەتاند ، کاتێ کە میللەتی ئیسلام پارچە پارچە بوون‌و بوون بە هـــەفتاو دوو کۆمەڵەوەو ڕێـگای سەرلێشێواوی و گومڕایی‌یان گرتە بەر ، زانای خراپ سەری ئـــەم فیتنەیە بوون‌و ، پێشەوای ئەم لادانە بوون ، بە دەگمەن وا بووە هەر کاتێ زانا لایدابێ‌و گومڕا بووبێ ئەو خراپەکاری‌یەیان کاری نەکردبێتە سەرخەڵـکی تر ،

---

(1) لێرەدا ئیمام مەبەستی ئەوەیە هانی سوڵتان‌و پیاوانی دەوروپشتی بدات ، جگە لەوەی خەڵـکی بەگشتی دابین کردووەو ئاراستـــەی کردون بەرەو ڕاستی ئەوەی مـــاوەتەوە سوڵتان‌و دەستەو پێوەندەکانێتی .

زۆربەی نەزانانی ئەم چەرخە ، ئەوانەی بە ناوی تەسەوفەوە قسـە دەکـەنو دەوری زانای خراپ دەبینن ، تێك چونیان دەبێتە هـۆی تەشەنە کردنی خراپیو تێك جوونی خەڵـکی تر ، جا ئەگەر هـەر کەسێك بتوانێ ئایینی ئیسلام سەرخاتو لە چنگی ئەمانە ڕزگاری بکاتو بەم کارە هەڵنەسێتو ، تەمەڵیو بێ گوێیی تێدا بکات ئەوە بەرامبەر بە ئیسلام لێ پرسراوەو ، موستەهەقی هەموو لۆمەو توانجێکە(۱) .

لەوانەیە زۆربەی خوێنەران ، پاش خوێندنەوەی ئەم نامـانەی ئیمام کـە زیاتر سوڵتانو زانایان تاوانبار دەکات سەبارەت بە تێك‌چوونی خەڵکیو دوورکەوتنەوە لە ئیسلام ، بۆیە دەڵێ مادام ئەوان بن کەمواتە بە لاچوونی ئەوان ئیسلام وەکو خۆی لێ دێتـەوە بۆ نمونە بەرپاکردنی شۆڕش بۆ لابردنی سوڵتانو ئەمجا دوورخستنەوەی ئەو زانا خـراپانە ئیتر هەموو شتێك کۆتایی دێت کاری بانگەوازیو چاکردنی خەڵـکی بەسەر شانیانەوە نامێنێت ، لە ڕاستیدا ئەم بۆچوونە زۆر هەڵەیە ، بۆ ؟

با بە نمونەیەك ڕوونی بکەینەوە ، زاناکانو ئەمجـا سـوڵتان توشی نەخۆشییەك بوون ، با بڵێین نەخۆشییەکی وەك سیل ، ئـەم نەخۆشییە بە ناو خەڵـکی تریشدا بڵاو بۆوە تا هەموو لایەکی گرتەوە.. لەم کاتەدا یەکێك بێتو بڵێت ئەم نەخۆشییە بەهۆی زاناکـانو سوڵتانەوە بڵاوبۆتەوە ئەگەر ئەمانە نەمان نەخۆشییەکە نامێنێت لـەناو خەڵـکیدا .. ئایا ئەم قسەیە لە لای هیچ ئاقڵ مەندێك پەسەند دەکرێت؟! تەنانەت ئەگـەر زاناو سوڵتانیش چارەسەر بکرێت ، نـەك لابرێتو دوور بخرێنەوە هەروا لە خۆیەوە ئەو نەخۆشییە سـەرو گوێلاکی

---

(۱) الرسالـة رقم ٤٧ .

خەڵکی ڕەش و ڕووت بەردەدات ؟ بێگومان نەخێر .. دەبێ لە ڕاستیدا هەمان چارەسەری ئەو خەڵکەی تریش بکرێت کە چارەی زاناو سوڵتانی بێ کراوە کەواتە لە کرداری چارەسەرکردندا هەردوولا یەکسان و پێویستیان بە یارمەتی دەبێ .. بەڵام ئەگەر هاتوو سوڵتان تووشی نەخۆشی بوو پێش ئەوەی نەخۆشییەکەی تەشەنە بکات و بڵاو بێتەوە ئەوە ئەو کاتە بە دوورخستنەوەی ئەو سوڵتانە سوود دەگەیێنێت ، دەنا پاش بڵاو بوونەوەی نەخۆشییەکە ئەو هەوڵدانە بێ سوودو بێ هودەیە ...

جا لە ڕاستیدا سەردەمی ئیمام سەرهەندی ئاوای لێ بەسەر هاتبوو ، نەخۆشی دەروونی و دنیا پەرستی لە ناو زاناکان و سوڵتاندا بڵاو بۆوەو ئەمجا بە ناو خەڵکیشدا تەشەنەی کرد ، ئیتر لابردنی سوڵتان چ کەڵکێ دەگەیێنێت بە تەنها ، بۆیە ئیمامی زاناو ژیر زوو دەرکی بەم مەسەلەیە کردوو دەردەکەیانی دەست نیشان کرد ، ئەمجا دەستی بەکارە نوێکاریەکەی کرد .. ئەوەتا ڕێگای لابردن و شۆڕش بەرپاکردنی نەگرتە بەر ، وەکو هەندێکی تر کە نەیانتوانی چارەیەکی ئەو دەردو گیرو گرفتە بکەن ، بەڵکو ڕێگای چارەسەرکردن و چاکردنی گرتەبەر بە مەرجێك لەم کارەیدا زاناو سوڵتانیشی لێ بێ بەش نەکرد بوو . ئەنجامەکەشی سەرکەوتوو بوو .

ئەمجا ئیمام دەڵێ :-

منی هەزار کە خاوەنی تێشوویەکی کەمم ، پێم خۆشە بەشداریتان بکەم و لە پشتیوانی ڕزگاری خوازانی ئیسلام بم ، بەڵکو بە هەموومان بتوانین شەریعەتی موحەممەدی سەر لە نوێ دامەزرێنینەوەو

بلاوی بکەینەوە ، تا موسلمانان لەو غەریبیەو بێ بایەخیە ڕزگـار بکەین[1] .

لە نامەیەکی تردا بە ( السید فرید ) دەڵێ :

موسلمانانی ئیمڕۆ غەریبن‌و لە گێروگرفتدا دەژین کەشتی ئالو بەیت لەم دەریای غەریبیە ڕزگاریان دەکات . پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ ( مثل أهل بيتي كمثل سفينة نوح من ركبها نجا ، ومن تخلف عنها هلك )[2] .

ئێوەش هەموو هیمەت‌و توانایەکان ئاراستەی ئەو ئامانجە مـەزنە بکەن ، تاوەکو ئەو بەختەوەریە مەزنەتان دەست بکەوێت ، خـوای گـەورە هەموو چەشنە پلەو پایەو سوڵتانێکی بێ بەخشیون جا ئەگـەر پێتوو شەرەفی نەسەب‌و بەختیاری دنیا کۆبکەنەوە ئەوا هـەموو بەختیاریەکی دین‌و دونیا کۆدەکەنەوە ، هەزارێکی وەکو من نیـازی گفتوگۆی هەیە لەگەڵتاندا سەبارەت بەم کارەو ، مەبەستیش ئەوەیـە لایەنگیری شەریعەتی ئیسلام بکات‌و ڕەواجی پێ بدات بۆیـە پێی خۆشە بە ئامادە بوونی لە لاتانا گەورەی کەن[1] .

لەم نامەیەدا ئیمام تەواضعێکی تەواو دەنوێنێت لە ئاستی ( سـید فرید ) داو مەبەستی ئەوەیە سەرنجی ڕابکێشێت دەنا ئیمام خۆی زۆر چاك دەناسێ‌و ئەویش چاك دەناسێ ، لە ڕاستیدا دەیەوێت ( سید فرید ) بکاتە هۆو کەناڵێك بۆ بەرینەوەی ئیسلام‌و گەیشتنی بـە سوڵتان‌و

---

(1) هەمان الرسالة رقم ٤٧ .
(2) رواه الطبراني والبزار وغيرهما عن ابي ذر (رضي الله عنه) .
(1) الرسالة رقم ٥ / للمجموعة الاولى .

دەست‌و پێوەندەکانی ، جا سیفەتی تەواضع جوانترین سیفەتە کەپێویستە
لەبانگکەردا پێت نەك خۆی فەرز کات بەسەر خەڵکیداو خۆی
لەوان بە زاناتر بداتە قەڵەم‌و هەموویان بە چاوی سوك سەیر بکات ،
چونکە مرۆڤ هەر چۆنێك پێت عیزەتی نەفسی هەیەو پێی خۆش نیە
یەکێکی تر خۆی بەسەردا زاڵ بکات‌و بە چاوێکی نزمتر لە خۆی
سەیری بکات ، بە تایبەتی کەسێك بیەوێ پەیامێك بگەیێنێ پێویستە ئەم
سیفەتەی تێدا بێت‌و لەم ڕێگەیەوە دڵی خەڵکی بکاتەوە بۆ وەرگرتنی
پەیامەکەی ... دەنا ئێمە دەزانین ئیمام تا چ ڕادەیەك شارەزاو
لێهاتوو و ، بلیمەت‌و زانا بوو ، کەچی بانگەوازەکەی بەو شێوەیە
نەبوو خەلکێ بۆ لای خۆی بانگ بکات‌و شوێنی بکەون ، بەڵکو
بانگی دەکردن ئیسلام زیندوو بکەنەوەو خۆیشی هۆیەکە لەو هۆیانەی
خەڵکی لە ئیسلام نزیك بخاتەوەو خۆی بە نیشاندەری قورئان‌و
خزمەتگوزاری ئیسلام دەزانی ئەو نەرم‌و نیانی‌یەی نواندویەتی لەبەر
خاتری خۆی نەبووە بەڵکو لەبەر نەرم کردنی ئەوان بووە بۆ ئیسلام .

لە نامەی سێ‌یەمدا بۆی ناردووە تیایدا دەڵێ

( گەورەم بەڕێز : ئیسلام لە ئیمرۆدا لێقەوماوو غەریبە ، ئەگەر
ئیمرۆ یەك دانە فلس لە پێناوی بەهێزکردن‌و لایەنگیری ئیسلامدا
خەرج بکرێت ، لە جیاتی ملیۆنەها دینار دادەنرێت ، کێ‌یە ئەو هەڵۆ
بەجەرگەی بەم کارە هەڵدەستێت با بیبینین ؟ ئەو کارەی مرۆڤ پێی
هەڵدەستێ بۆ بلاوکردنەوەی ئاین‌و پشتگیری ئیسلام ، لە هەموو
سەردەمێکدا کردەوەیەکی جوان‌و خۆشەویستە ، بەلام ئیمرۆ کە
ئیسلام غەریب‌و بێ کەسە ئەوا ئەو کارە جوانترو خۆشەویسترە ،
پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم دەفەرموێ : ( انکم فی زمان من ترك

منكم عشر ما أمر به هلك ، ثم يأتي زمان من عمل منهم بعشر مـا امر به نجا )[1] • ڕووده‌كاته سه‌حابه‌كان‌و ده‌ڵێ ( ئێوه له زه‌ماننێكدان هه‌ر كامێكتان ده فه‌رمان له‌و فه‌رمانانه‌ی ئه‌مری پێ كراوه وازی لـێ بێنێ دۆزه‌خی‌یه ، پاشـان زه‌مانێك دێت هه‌ر كامێكتان ده فه‌رمان لـه‌و فه‌رمانانه‌ی ئه‌مری پێ كراوه جێ به‌جێ بكات ئه‌و (به‌هه‌شتی‌یه) •

كه‌سی دووه‌م كـه ئیمامی سه‌رهه‌نده‌ی هه‌ڵی بژارد بوو ( ركن الدولة )ی مه‌غۆلی ( خان اعظم )ه به‌نازناوی (كوكه) ، ئیمام نامه‌یه‌كی بۆ ده‌نێرێ‌و تیایدا ده‌ڵێ

• خوای گه‌وره پشتگیریتان بـكات به‌سه‌ر دوژمنانی ئیسلام سه‌رتان بخات له پێناوی به‌رزكردنه‌وه‌ی ئیسلام پێغه‌مبه‌ر صلى الله عليـه وسلم ده‌فه‌رموێ : بدأ الاسلام غريباً وسيعود غريباً كما بدأ فطوبى للغرباء[1]•• غه‌ریبی ئیسلام گه‌یشتۆته ڕاده‌یه‌ك له وڵاتدا ، كافران ده‌م درێژی ده‌كه‌نه سه‌ر ئیسلام‌و گاڵته به موسڵمانان ده‌كه‌ن ، هیچ شه‌رم نایانگرێ كـانێ كافرێتی خۆیان ئاشكرا ده‌كه‌ن ، له به‌رامبه‌ر ئه‌وه‌وه موسڵمانان ناتوانن ئیسلامه‌تیه‌كه‌ی خۆیان ده‌رخه‌ن ، به‌ڵكو گاڵته‌یان پێ ده‌كه‌ن‌و زه‌مـیـان ده‌كـه‌ن ، پاشان ده‌ڵێ :ـ

• ئێمـه ئیمڕۆ بوونی پیرۆزی جه‌نابتان به نیعمه‌تێـكی گـه‌وره داده‌نێین ، جـگه لـه ئێوه ، ئیمڕۆ شاسوارێكی تر نابینین به‌ربه‌رجی دوژمنانی ئیسلام بداته‌وه ، خوا پشتگیرتان بـكات‌و سه‌رتان بخـات فه‌رموده‌یه‌كی پێغه‌مبه‌ر صلى الله عليه وسلم ده‌فه‌رموێ • لن يؤمن احدكم

---

(١) رواه الترمذى ، وقال حديث غريب •

(١) رواه مسلم •

حتى يقال انه مجنون »[1] • ئەگــەر ئەو شێتی‌یە هاندەرەکەی زۆری غیرەت بێت بۆ ئیسلام ، لە کەسێکی تردا نابینین جگە لــە دڵو دەروونە بە جۆشەکەی ئێوەدا نەبێت ، زۆر سوپاس بۆ خــوا ، ئیمڕۆ ڕۆژ ڕۆژی باداشتی زۆری پڕ بایەخە لەسەر کردەوەیەکی بچوکی کەم نرخ ، ئەم هەلەی جیهادکردن بە وتنی حەقو ڕاستی لە دەستی خۆتان مەدەن کە خوای گەورە بۆی ڕەخساندوون ئەویش ( جهاد الاکبر )ە ئەم هەلە بە دەست بهێنن‌و بڵێن ( هل من مزيد ) ، ئەوەش بزانن ئـەم تێکۆشانە بەزمان ، بە تایبەتی لەو کاتەدا زۆر پیرۆزترە لـە تێکۆشـــان بەشیرو تیر ، هەر ئێمەی هەزارو پەك کەوتووین لەم نیعمـە بێ‌بەش بووین : ( هنيئاً لأرباب النعيم نعيمهم وللعاشق المسكين‌ما يتجرع ) با خاوەن نیعمەتان ئەو نیعمەتەیان بنۆشن‌و عـــاشقانی داماویش ئـــەو تاڵی‌یەیان بچێــژن •

ئەوا ڕێـگای ئەو گەنجینە شاراوەیەمان نیشان دای ، هەرچـەندە من نەتوانم بە دەستی بهێنم بەڵـکو تۆ بتوانی بەدەستی بهێنی • ئیـــامی سەرهەندی خۆی خاوەنی مەسەلەکەیەو سەری پەتەکە بە دەســــتی خۆیەتی ، کەچی لە نامەکانیدا وای دەردەخات ناتوانێ هیچ بـــکات‌و ئازایەتی‌و چابوکی دەداتە باڵ ئەو پیاوانەی نامەی بۆ ناردوون ، لـــــە ڕاستیدا ئەم کارەی جوانترین شێوازە دەینوێنێ چونکە هاندانێکی ئەوانە دەیانـکات بەخاوەنی مەسەلەو لێ‌پرسراویان زیاتر دەکات‌و دەمـــاری

---

(١) زەهەبی لە تەلخیصدا دەڵێ ( صحيحه ) رواه الامام احمـــد في المسند وابن حبان في الصحيح • لەفزی حەدیسەکە لە موستەدرەکدا دەری هێناوە دەفـــەرموێ ( اكثر ذكر الله حتى يقولوا مجنون ) ص٤٩٩ ج١

بەزەیان دەجوڵێنێ لە لایەکی ترەوە نەفسی خۆی دەپارێزێ لـــــە ڕیایی‌و لەخۆبایی بوون جۆرە تەواضعێکیش لە ئاستیاندا دەنوێنێ تاوەکو زیاتر لە خۆیانی نزیك بکاتەوە ، ئەوەتا هەمان ئاکار دووبارە دەکاتەوە لە نامەیەکی تردا کە بۆ ( خان جهانی) ناردووەو تیایدا دەڵێ :

« ئەگەر بێتو لە نێوان ئەو پایە بەرزەی هەتانەو پەیڕەوی کردن بە شەریعەتی ئیسلام ، کۆبکەیتەوە ئەوا ئەمانەتی پێغەمبەرانت گەیاندووە لە ڕوونکردنەوەی ئاین‌و بڵاوکردنەوەی ، جا ئێمەی هـەژار ئەگـەر بۆ ماوەی چەندین ساڵی دوورو درێژ هەوڵ بدەین ناگەینە تۆزی بازێکی ئیسلامی لە نمونەی ئێوە .. خەڵـکی نرخی ئەو نیعمەتە نازانن ، خوای گـەورە بە ئێوەی بەخشیوە ، ئەترسم ئێوەش نرخ‌و بەهای ئەو نیعمـەتە نەزانن کاتێ سوڵتانی مەزن(جهانگیر)گوێ لە قسەکانت بگرێت بەجوانی‌و، هەقی خۆی بداتێ . ئەم هەلە چەند خۆشە ، کە بە دەربڕینێکی ئاشـکرا یان بە ئیشارەت وتەی هەق بە سوڵتان ڕابگەیێنین ئەو ڕاستی‌یەی کـــە ئەهلی سوننەو جەماعە لەسەری دەڕۆن ، خوای گەورە ستایشی ئـــەو تێکۆشانەیان دەکات ، هەر کاتێ گونجا بە وتەی ئەهلی هەق لێیان نزیك ببنەوە ، هەمیشە چاوەڕوانی موناسەبەیەك بن‌و بە هەلی بزانن تیایدا باسی ئاین‌و شەریعەتی ئیسلام دەکرێ ، تا ئەو هەلە بەدەست بهێنن ئیسـلامی تیا ئاشکرا ئەکرێ‌و کوفری بوچەڵی تێدا دەرئەخرێ »[1] .

جگە لەم نامانە ئیمامی سەرهەندی نامەی تری زۆری ناردووە بـۆ پیاوانی تری دەوڵەت ، یەکێکی تر لەوانە ( الأله بیك )ی والی ناوچـەی (بەهار)ەو هەمان بابەتی بۆ نوسیوەو تیایدا دەڵێ :

---

(١) الرسالة رقم ٦٧ المجموعة الثانية .

( خوای گەورە ، نمونەی ئێوەو پارێزەرانی ئیسلام زیاد کـــات ، نزیکەی سەدەیەکی تەواوە بەسەر غەریبی ئیسلامدا تێپەڕیوە ، بـاری نالەباری لەم ولاتـــەدا گەیشتۆتە ڕادەیەك ، ئەهلی کوفر هـەر بەوەندە ڕازی نابن بە کافرێتی‌کەیان کاربکەن ، بەڵکو دەیانەوێ ئەحکامەکـانی ئیسلام بە تەواوەتی لەناوبەرن تا بە هیچ جۆرێك جیاوازی لە نێوان کوفرو ئیسلامدا نەمێنێ ، کار گەیشتۆتە ڕادەیەك ئەگەر موسڵمانێك بیـــەوێت دروشمێك لە دروشمەکانی ئاینەکەی وەك سەربڕینی مانـگا دەربخـــات ئەوا بە کوشتن‌و خنکاندن سزای دەدرێ )(۱) .

لە نامەیەکی تردا کە بۆ ( صدر الجهان )ی ناردووەو یەکێکە لـــە گەورە میرانی دەوڵەت دەڵێ :ـ ( من لەو بڕوایەدام کـــە پێشەوایانی ئیسلام‌و زانایانی پایە بەرز خەریـکی لایەنگیری ئاینی پیرۆزن‌و بەهێزی دەکەن‌و پشتگیری لێ دەکەن بنای ڕێـگای ڕاست دروست دەکـــەن‌و واخەریـکن تەواویشی بکەن ـ بە نهێنی‌و ئاشکرا ـ جا ئیتر ئەم هـەژارە یەك کەوتەیە پێویست ناکات خۆی ماندوو بـکات‌و قسە درێژ کاتەوەو لەوە زیاتر بڵێت )(۲) .

---

(۱) الرسالة رقم ۱۸۱ .
(۲) الرسالة رقم ۱۹٤ .

## هەق نیە ئەم هەڵەیە دووبارە بکرێتەوە[1] :

لە ئاکامی ئەم هەوڵو تێکۆشانە بەردەوامو لەسەرخۆیی‌یەی ئیمام دا ئەو کـاتە خۆش‌و پڕ لە مزدەیە هات کـە سوڵتان جیهانگیر تایدا هەستی بەهەڵەی خۆی کردو ، بڕیاری دا بە پێی پانـــای گشتی حکومەت‌و ئیـــدارە ، لیژنەیەك لە زاناکان پێك بهێنێ بۆ ڕاویژکردن سەبارەت بە کارو باری ئاینی‌و دوورخستەوەی وڵات لەو هەڵەو گیروگرفتانەی لەم ڕووەوە تێی کەوتبوون ، داوای لە یاوانی ئاین بەروەرانی وڵات کرد بە شوێن زانایانی لــە خواترس‌و دڵسۆز بکەرێن‌و بیـان هێنن بۆ ناو کۆشك‌و هانیان بدەن تا لە کۆشکدا بە بەردەوامی بمێننەوەو ، دەربارەی مەسەلەکانی شەرع بدوێن‌و سەبارەت بە بابەتەکانی ئاین فـەتوا بدەن‌و ڕێنمایی‌یان بـــکەن .

کاتێ ئیمام سەرهەندی بەمەی زانی بە پێی ئـــەو حیـــکمەت‌و پێش‌بینی‌یە ئیمانی‌و بەصیرەتەی پێی بەخشرا بوو ، پێی لادانی دەوڵەتی پێشوو و ، مێژووەکەیشی دەزانی لـــە کوێدایەو لــە چ کاتێـکدایەو هۆیەکانی زۆر چاك دەزانی چی‌یە ، بۆیە لەم کارە ڕاچڵەکی لە جیـاتی

---

(١) رجال الفكر والدعوة / الامام السرهندى .

ئەوەی بەم هەواڵە دڵخۆش بێت ـ لە ڕواڵەتدا ـ کەچی زۆر دڵ گران بوو ، هەر لەبەر ئەوە بوو نامەیەکی بۆ میر ( السید فرید )و نامەیەکی تریشی بۆ میر ( صدر جهان ) نارد ، تیایدا پێی وتبوون :

« بۆ خوا داواتان لێ دەکەم ئەم هەڵەیە نەکەن ، یەك تاکە زانای خودا ناسی دڵسۆز هەڵبژێرن ، لە جیاتی ئەوەی کە چەند زانایەکی ظاهر هەڵبژێرن »

لە نامەیەکی تردا کە ئاراستەی ( السید فرید )ی کردووە دەڵێ : ( خوای گەورە لەسەر ڕێگەی بلوو باپیرانی بەڕێزتان دامەزراوتان کات ، وەکو بیستومانە سوڵتان بەهۆی ئەو فیطرە پاکەی و خۆشەویستی‌یەی بۆ ئیسلام هەیەتی فەرمانی پێ‌کردوون چوار زانا هەڵبژێرن بۆ ئەوەی لە کۆشکدا بمێننەوەو مەسەلەکانی شەرع ڕوون بکەنەوە ، تاوەکو هەر کردەوەیەك یان خوکمێك لە سوڵتانەوە دەردەچێت پێچەوانەی ئەحکامەکانی شەریعەتی ئیسلامی پیرۆز نەبێت ، هەزاران جار سوپاس بۆ خوا ، هیچ مژدەیەك نیە لەم مژدەیە مەزنتربێت بۆ موسڵمانان ، هیچ هەواڵێك نیە لەم هەواڵە خۆشتر بێت بۆ خۆش کردنی دڵە برینداره‌کانو تەعزێ باران ، بەڵام منی هەژار ناچارم لەم بارەیەو لەگەڵتا بدوێم ، داوای لێ بوردتان لێ دەکەم .. ئەوەی دمەوێ بیڵێم ، ئەوەیە وێنەی ئەم زانا ئاینپەروەرانەی خۆیان لە خۆشەویستی پلەو پایەو سوڵتان بەرزتر ڕابگرنو جگە لە لایەنگیری ئیسلامو سەرخستنی ئاینو بڵاوکردنەوەی شەریعەتی پیرۆز هیچ خەمێکی تریان نەبێت ، زۆر کەمو دەگمەنن ، جا ئەگەر هاتوو یەکێك لەم زانایانە مەیلی بەرەو پایە بەرزی بێت ئەوە هەوڵ دەدات فەزڵو بلیمەتی‌و لێهاتوویی خۆی دەربخات ، بۆ ئەم کارەیشی مەسەلەکانی خیلاف دەهێنێتە کایەوەو دەیەوێت

لەو ڕێگەیەوە خۆی لە سوڵتان نزیك بکاتەوە تا ڕێزی لێ بگرێتو پایەی بەرز بکاتەوە ، ئەمەش دەبێتە هۆی تێکدانی ئاینو شێواندنیو توشی مەترسی دەکات ، هەر هۆی ئەم جەشنە خیلافانە بوو لە سەدەکانی ڕابووردودا لە نێوان زاناکاندا کارەساتی ناخۆش ڕوویداو ، دنیا بە جارێك توشی چەرمەسەری هات ، جا ئەگەر بێتو وابکەن ، هەمان مەترسی دەگەڕێتەوەو دەبێتە هۆی شپرزەکردنی ئاین ، چ جای پشتگیری کردنیو چەسپاندنی !.. پەنا بەخوا لەم ڕووداوانەو ، لە فیتنەی زانای خراپ ، لە جیاتی ئەوەی چوار زانا هەڵبژێرن چاکتر وایە یەك زانا هەڵبژێرن ، چونکە ئەمەیان گونجاو ترو لەبارترە بە تایبەتی ئەگەر لە زانایانی ئاخیرەت پەروەر بێت دەبێ چی لەوە چاکتر بێت ، جا ئەگەر لە زانایانی ئاخیرەتپەروەر دەست نەکەوت ، با لە جێی زانایان یەکێك هەڵبژێرن کە حاڵی لە هەموویان چاکترو فەزڵی زیاتر بێت « فما لا یدرك کله لا یترك کله » ) لە ڕاستیدا ئەم یاسا مەنتقییەی کە ئیمام لەسەری ڕۆیشتووە لە بانگەوازەکەیدا لە هەموو سەردەمێکدا پێویستە بانگەرانی ڕێگای خوا لە سەری بڕۆن ، ئەگەر خێرو چاکە هەمووی بە تێکڕایی دەست نەکەوت ، هەندێکیشی دەست بکەوێت هەر باشە ، چونکە « وازهێنان لە کارێك کە هەموو چاکەی تێدا نەبێتو هەندێکی تێدا بێت ئەوە وازهێنانە بە جارێ لەو کارە ئەو هەندە خێرەش لەکیس دەچێت » وەك ئەو مەسەلەی دەڵێ ( عدم الرضا بالقلیل أقل ) ڕازی نەبوون بە کەم کەمترە ... ئەوەتا دەڵێت ئەگەر زانایەکی چاکی لەخواترس دەست نەکەوت با یەکێکی تر بێت هەرچەندە ئەو خاسیەتانەی هەموو تێدا نەبێت بەڵکو هەندێکیشی تێدا بێت باشترە لەوەی هەر بە تەواوەتی وازی لێ بهێنرێو کارەکە بێت بە هەرەمەکیو ئاژاوەچێتی .. تەنانەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەسەر ئەم

ڕاستی‌یە بوو کـە ڕازی بوو بە سوڵحی حودەیبیە بە ڕواڵەت بڕیاری پەیمانەکەی لەگەڵ قوڕەیش زۆربەی بەرژەوەندی کافرانی تێدا بوو ، بەڵام پاشان لە ئەنجامدا دەرکەوت کە بەرژەوەندی موسڵمانانی تێـــدا بوو تەماشا دەکـەی کاتێ دەنوسێ بسم اللہ الرحمن الرحیم لەســـەر پەیمانەکە کافران ڕازی نابن‌و دەڵێن ئەگەر ئێمە باوەڕمان بەمـــەی تۆ کرد ئیتر ئێمە پەیمانی چی دەبەستین لەگەڵتا کەچی پێغەمبەر صلی اللہ علیہ وسلم چیـان وت ڕازی بوو ‥ دەڵێن شۆڕشگێرێك پەیمانێك لەگەڵ دوژمنەکەیدا دەبەستێ لەو پەیمانەدا زۆر مـــەرجی قورس لەســـەر شۆڕشگێرەکە دادەنێت ئەم هەر ڕازی دەبێت ‥ پاشان خەڵـــکی‌و بە تایبەتی شوێن کەوتوانی‌و نزیـکەکانی ئەمە بەسەرشۆڕی دادەنێن بـۆ ئەو شۆڕشگێرەو دەڵێن بەزیوە ، وای بۆ لێك دەدەنەوە کــــە ئـــەم شۆڕشگێرە سەرکاروانچی بووەو شمشێرێـکی پێ‌یە بۆ پاراستنی ئـەو کاروانەو گەیاندنی بۆ جێ‌و مەبەستی خۆی‌و ئەو ئامانجەی مەبەستی‌یەتی ئەمجا دەڵێن لە ڕێـگا جەردە ڕێی پێ دەگرێ‌و داوای شمشێرەکـە دەکـاو لێی دەستێنێ ئەم قسانەی خەڵـکی وەکو جۆرە گاڵتە پێ‌کردنێك گاڵتەیان بە شۆڕشگێر دەکرد : ئەمیش لەوەڵامدا پێی وتن قسەکانتـان ڕاستە، ئەگەر ئەو شمشێرەم نەدایە بەو جەردەیە ئەوا هەر لە نیوەی ڕێگا پەکم دەکەوت‌و نەم دەتوانی کاروانەکە بگەیێنمە جێگای خۆی چونـکە ئەو جەردەیە خۆیشم‌و شمشێرەکەش‌و کاروانەکەشی دەبرد ، ئەوا من شمشێرەکەم دایە ، تاکاروانەکە بە بە سەلامەتی بگەیێنم‌و ئامانجەکە پێـــە دی ئەو کاتە دەگەڕێمەوە شمشێرەکەو هەرچیش پێ‌یەتی لێی دەسەنم جا گرنگ نیە ئەم شۆڕشگێرە لەسەر هەق بووە یان ناهەق ، چونـــکە ئەگەر هۆو وەسیلەی ڕاسـت بەکارهات هەرچەندە ناهەقیش بێت دەگـاتە ئامانج بەڵام ئەگـەر هەقی پێ بێ‌و پەیوێ لە ڕێـگەی هەڵـەو هـــۆو

وەسیلەی ناهەقەوە بیکەیێ هەرچەندە هەقیشی پێ بێت هەر ناگـــات ،
تەنانەت ئەگەر هەق‌و ناهەق‌و دژ بە دژی یەك وەستان هـــەر کامێکیان
ڕێـگای ڕاست‌و ڕەوان بەکاربێنێت ئەوە سـەرکەوتووە بە چاوپۆشین
لەسەر زاتی هەقەکەو زاتی ناهەقەکـە ، وەکو مامۆستا سـەعید نورسی
دەفـــەرموێ.

( هەروەکو مەرج نیە کە هەموو وەسیلەیەك لـــە وەسیلەکانی
هەق ، هەق بێت ، هەرواش مەرج نیە هەموو وەسیلەیەك لە وەسیلەکانی
ناهەق ناهەق بێت ، کەواتە ئەنجام وەسیلەیەکی هەق ( هەرچەندە لـــە
ناهەقدا بێت ) سەردەکەوێت بەسەر وەسیلەیەکی ناهەقدا ( هەرچەندە لە
هەقـــدا بێت )[1] .

کەواتە پێویستە بانگکەرانی ڕێـگای خوا پێش ئەوەی ئەو هەقەی
پێیانە بیکەێنن دەبێ ڕێـگاو وەسیلەی هەقی بۆ بدۆزنەوە بۆ گەیاندنی
کـە بەستراپێتەوە بە مەرج‌و بارو دۆخ‌و کاتی سـەردەم ، نـەك هـەر
ئەوەندە بڵێت هەقم پێیە هـــەر چۆنێك بووە دەیکەێنم .. چونـکە بە
گوێ‌کردنی یاسای ژیان‌و بوونەوەر پێویستە بۆ سەرکەوتن لەم دنیایەدا
هەر وەکو چۆن بە گوێ کردنی یاسای شەرع پێویستە بۆ سەرکەوتـن
لە ڕۆژی دوایدا ... هەروەکو مامۆستا نورسی دەڵێ هــــەر وەکو
چۆن گوێڕایەڵی‌و یاخی بوون هەیە سەبارەت بە فەرمانەکانی شـــەرعی
ئیسلام ، هەر بەو چەشنە گوێڕایەڵی‌و یاخی بوون هەیە سەبارەت بـــە
فەرمانەکانـــی یاسای بوونەوەرو ژیان . هەر وەکو چۆن گوێڕایەڵی‌و
بێ‌گوێی یەکەم لە دوا ڕۆژدا پاداشت‌و سزای هەیە ـ هەر بەو چەشـــنە

(١) حقائق الايمان / بديع الزمان سعيد النورسي .

گوێڕایەڵو بێ‌گوێی یاساکانی بوونەوەرو زیان زۆربەی جار سزاو پاداشتی خۆی لە دنیادا وەردەگرێتەوە )[1] .

لێرەدا ڕوون بۆوە کە ئیمامی سەرهەندی چۆن ویستویەتی ڕێگاو وەسیلەی هەقو ڕەوا بگرێتە بەر لە بانگەوازەکەیدا لـــە ئاکامیشـــدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا ، هەرچەندە هەموو بەری تێکۆشانەکەی بـــە چاوی خۆی نەدی لـــە ژیانیدا ، بەڵام گرنگ ئەوەیە کـــە تۆوەکەی چاندو هەندێکیشی بەخێو کرد ئیتر بەجێی هێشت بۆ ئەو کەســـانەی خۆی بە دەستی خۆی پەروەردەی کردبوونو ڕێگاو بەرنامەی گەیاندنی کاروانەکەی بۆ داڕشتنو بۆیانی دەست نیشان کرد .. پاشان لە هەمان نامەی کـــە بۆ ( السید فرید )ی ناردووە دەڵێ :

مەبەستی من ئەوەیە کە هیچ نەکەن تا چاك لێکی نەدەنەوەو لێی ورد نەبنەوە ، چونـــکە پاش جێبەجێ‌کردنی ئیتر هیچ داد نادات بـــە فریا ناکەوێت ، من لە ڕاستیدا زۆر شەرمەزارم لەم قسانەم کـــە لەگەڵ خاوەن دڵو دەروون پاكو زیرەكو بلیمەتێکی وەکو جەنابتان دەیـــکەم ، بەڵام چونکە ئەمە هۆی بەختەوەری منە بۆیە زۆر بە پەرۆشم بۆ ئـــەم واتانـــــە[2] .

جـگە لەو پیاوانەی پێشوو کە باسمان کردنو ئیمام سەرهـەندی نامەی بۆ ناردون لە خامە ڕەنگینەکەی خوێنو فرمێـسکی دەتـــکان بۆ غەریبیو کەساسیو بێ‌کەسی ئیـسلام لەو سەردەمەدا .

ئیمام نامەی تری پەروەردەییو ڕاستکردنەوەی زۆری ناردووە

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو .
(٢) الرسالة رقم ٥٣ / المجموعة الاولی .

بۆ گــەورە پیاوانی دەوڵەت ، تیایدا بابــەتی پەروەردەو ســلوکو گیروگرفتی تەریقــەتی ڕوون کردۆتەوە ، ئەو نامانەش نێرراون بۆ (١) عبدالرحیم خان خانان (٢) قلیج خان الاندجانی الاکبری (٣) خواجه جهان (٤) میرزا داراب ابن خان خانان الجهانگیری (٥) شرف الـدین حسین البدخشي •

لە نوسینی نامەکانیدا وا دەردەکەوت ، ئەم گەورە پیاوو میرانــە ئیمــام سەرهەندیان زۆر خۆش ویستبێو ، زۆر ڕێزیان لێ گرتبێ ، هەر وەکو چۆن شێخێکی ڕابەر بۆ مریدەکانی خۆی دەنوسێ ئاوا نامەی بۆ ئەوان نوسیوە ، هەڵەکانیانی دەستنیشان کردووەو ، ئامۆژگــاری کردوون ، لە نامەکاندا ئەوەش دەردەکەوێت کە ئەم میرو پیاوانە کەمو کوڕیان نەنواندووە لە ئامۆژگاری کردنو سۆز بەخشین بۆ ئیســلام ، تا توانیویانە بە هەموویان ئەو ئامانجە مەزنە بەدەست بهێنن •

## کاریگەرێتی ئیمامی ڕەببانی

ئەوەی تا ئێستا باسمان کرد پەیوەندی بەو تێکۆشانەوە بوو کــە ئیمام لە ڕێــگەی میرەکانەوە کردوویەتی ، ئەو نامانەی پەیتــا پەیتــا دەینارد بۆ میرانو پیاوانی دەوڵەتو هانی دەدان بــۆ ئــەوەی ئیســلام سەربخەنو پارێزگاری ئاین بــکەنو سوڵتان بۆ ڕێزگرتنی دروشــمی ئیسلامو جێبەجێ کردنی شەریعەتی ئیسلام ئاراستە بکەن ، تاوەکو ئەو وەزعە خراپو تێکچووەی تێــدان چاکی بکەن ، ئەو نامانەی لە جۆشو

(١) رجال الفکر والدعوة / الامام السرهندي / ابو الحسن الندوي •

خرۆش‌و حه‌ماسه‌تدا ده‌یان گرماندو ده‌یان بروسکاند له هێزو غیره‌تدا به‌تاو شه‌پۆلیان ده‌دا ، له نه‌رمی‌و خۆش گوفتاریدا خه‌ریك بوو ده‌توانه‌وه ئه‌م هه‌وڵ‌و تێکۆشانه‌ی له ڕێنگه‌ی نامه‌کانیانه‌وه به‌زایه نه‌چـوو بۆ ته‌واوکردنی نه‌خشه‌و به‌جێ‌هێنانی ده‌وره‌که‌ی ، ئه‌و نامانه‌ی بۆ هـه‌ر کامێکیان نێرراوه ده‌وری خۆی دیوه ، به تایبه‌تی کاری زۆری کردۆته سه‌ر میر ( السيد فريد ) کـه بـه ده‌ورێکی گرنگ‌و سه‌ره‌کی‌و سه‌رکه‌وتووانه هه‌ڵسا بۆ گۆڕینی ده‌وڵه‌ت‌و سه‌رله‌نوێ ئاراسته‌کردنی به‌ره‌و ئیسلام •

تا ئه‌و کاته‌ش هێشتا له ده‌روونی سوڵتان جیهانگیردا گۆڕانێکی بنه‌ڕه‌تی وا ڕووی نه‌دابوو کـه له ڕه‌گ‌و ڕیشه‌وه بووبێت ، ئـه‌و گۆڕانه‌ی ئه‌م کاره گرنگه مه‌زنه پێویستی پێ‌یه‌تی بۆ گۆڕانکاری‌یه‌کی ئه‌وتۆ وڵات له‌سه‌روبنه‌وه بگۆڕێ‌و ڕۆحی ئیسلامی بکرێته‌وه به به‌ریدا، ئه‌و ڕۆحه‌ی سه‌دان ساڵه ئه‌م وڵاته‌و دانیشتوانه‌که‌ی چاوه‌ڕوانیه‌تی • • ئه‌وه‌ی کـه له هه‌موو که‌س ئاشکرایه که‌سێتی سوڵتان خۆی له ڕژێمی پاشه‌یه‌تیدا پێتی سه‌ره‌کی داگیر ده‌کات‌و جه‌مسه‌رێکه تێکڕای ده‌زگـاو دامه‌زراوو ڕێکخراوه‌کانی ده‌وڵه‌ت به ده‌وریـدا ده‌سـوڕێنه‌وه ، ئه‌گـه‌ر نیازێـکی پێ یان شوێن فیکره‌یه‌ك بکه‌وێ • یاخود که‌سێکی خۆش بوێ ، باوه‌کو باوه‌ڕی به یاوێـکی خودا ناسی دڵسۆز بێ‌و ڕێزو شکۆی ئـه‌وی له دڵدا بێ‌و ، متمانه بـکاته سه‌ر ڕاستێتی‌و باوه‌ڕی به دڵسۆزی ئه‌و که‌سه هێنابێ ، ئه‌وا ئه‌و که‌سه ماوه‌ی هه‌زاران میل له چه‌ند سه‌عات‌و خوله‌کێکدا ده‌بڕێت ، موسته‌حیل ده‌کاته مومکین‌و به‌ڵـکو ده‌یکاته کارێکی واقعانه[1]•

---

[1] الامام السرهندي / ابو الحسن الندوي •

جا جهانگیر تا ئەو ساتەش پلەو پایەی ئیمانی لە زانستو خودا ناسیدا نەدەزانی ، چونکە لەو زاناو شێخانە نەبوو کە هاتو چۆی کۆشكو کۆڕی پاشایانی دەکرد ، کەواتە چ ڕێگایەك هەبێت ڕاستەوخۆ پەیوەندی پێوە بەستێ ، تاکو بەرزی پلەو مەزنی پایەی لە سنووری تواناو لێهاتوویی‌دا بناسێ ؟... ئا لەم کاتەدا بوو چارەنوسی خوای گەورە ئەم کارەی جێبەجێ کرد . تەفسیرێکی عەمەلی فەرموودەکەیەتی ( عسى ان تكرهوا شيئاً وهو خير لكم ) .. پێویستە یەکێکی وەکو ئیمامی سەرهەندی نیازی خۆی بۆ سوڵتانو میرو وەزیرو خەڵکیش بەگشتی ئاشکرا بکاتو بزانن مەبەستی لەم بزوتنەوەو بانگەوازەی چی‌یە ! تاوەکو تۆمەتو بوختانی وای نەخرێتە پاڵ کە کارەکەی بە سیاسی‌یەکی ڕووتو ئامانجێکی دنیایی لە قەڵەم بدرێت .. بەڵێ خەڵکیو میرو وەزیرەکان هەموویان زانی‌یان مەبەستو ئامانجی ئیمام چی‌یە ! زانیان ئامانجی ڕاستکردنەوەو چاکردنێ پەروەردەکردنو گەڕاندنەوەی ئایینی ئیسلامی پیرۆزە نەك بە شۆڕشو کوشتار بەڵکو لە ڕێی ئاشتیو ئاسایشو پەروەردەکردنەوە بێت لە ڕێگەی قەناعەت چەسپاندنی ئیمانەوە بێت ، نەك لە ڕێگەی چەسپاندنی دەسەڵاتو خۆ زاڵ کردن بێت بەزۆر .. کەواتە ئەم نیازو ئامانجە تەنها سوڵتان جیهانگیرە ماوە پێی بزانێو لە خوو ڕەوشتو ڕەفتارو گوفتاری ئیمامدا خۆی بنوێنێ نەك تەنها بە قسەو پروپاگەندە کردن !

جا دەبێت سوڵتان چۆن کاری تێ کرابێت :-

لە پێشەوە باسی بەسەرهاتو چۆنیەتی بەندکردنی ئیمامان کرد لە قەڵای کوالیاردا چۆن بوو ، هەروەها ئەوەمان باس کرد کە چۆن لە ئۆردوگای سوڵتاندا بەدەستبەسەری ماوەتەوە ، مانەوەکەی نێ ساڵو

شەش مانگی خایاندووە ، لەو ماوەیەدا بواری ئەوەی بووە لەگەڵ سوڵتاندا هاوڕێیەتی بکاتو هەڵسو کەوتی لەگەڵ بنوێنێو لە مەسەلەکانی ئایین لەگەڵیدا بدوێ ، ئەم هاوڕێیەتیو لەگەڵدا بوونەی ئیمامی زۆر بە چاکی بە سوڵتان ناساندووەو ، ڕەوشت بەرزیو ئاکار جوانیو دەروون بەهێزی تێدا بەدی کردووە ، ئایین پەروەریەکی بەتینی لێ بینیوە ، بە تایبەتی لەو هەڵوێستەیدا کە بە ئاشکرا دەری خست سوجدەی درودیو ئادابی ڕەسمی کۆشکی لەبەر دەم سوڵتاندا جێبەجێ نەکردو نەینواند ، هەروەها مانەوەی لە قەڵای گوالیاردا بە چەشنێکی سەربەرزیو دەروون فراوانیەوەو ، مل کەچ نەکردن بۆ سوڵتان تا داوای لێ بوردنی لێ بکاتو ، جگە لەوەی بە چاوی خۆی دەیدی هاوڕێیەتیو هەڵسو کەوتی چ کارتیکردنێکی هەیە ! دەروونە خاوێنەکەی چ دەورێکی هەیە ! هێزە ڕۆحیەکەی کارێکی وای کرد بوو بە سەدان کافری موسڵمان دەکرد ، هەروەها مانەوەی لە تۆردوگاداو بۆ ماوەیەکی درێژخایەن هەموو ئەو زوهدو ( تقشف )و دوورە پەرێزییەی لە دنیاو ، زۆری خوداپەرستیو گرنگی دانی بە ویردەکانو زیکرەکان چاو پێ کەوتو ، ڕۆچونو پایەبەرزی لە زانستدا لە دانیشتیانو گفتوگۆیان پێکەوە بۆ دەرکەوتبوو . جا جیهانگیر فەرمان ڕەوای دەوڵەتێکی مەزن بوو ، خاوەنی دەروونێکی خاوێن بوو ، زیرەکو لێهاتوو بوو ، هەلێکی وای بۆ هەڵ کەوتبوو تا بتوانێ زۆر لە میرو زاناو شێخو پیاوانی دنیاو مادە پەرستانو ، پیاو چاکانو ئایین پەروەران بناسێت لە سەردەمی ئەکبەری باوکیەوە تا سەردەمی فەرمان ڕەوایەتی خۆی ، ئەمە وای لێ کرد بوو مەلەکەی ناسینی دەروونو تەبیعەتی خەڵکی تێدا دروست بوو بوو ، ئەمە دەستی هەموو کەس ناکەوێت

ئەگەر هەڵێکی وا چاکی شارەزا بوونو ڕەخنەکاری بۆ هەڵ ناکەوێت ، تا بتوانێ درۆو ڕاست لە یەکتر جیا بکاتەوە ، کەواتە هیچ گومـانی تێدا نیە سوڵتان ، ئیمام سەرهەندی چاك بۆدەرکەوتبوو لە چەشنە پیاوێکی ترەو ، زۆر زۆر لەو پیاوانە جیاوازە کە پلەو پایەیان لە دەوڵەتدا بە دەستەوە بوو ، کۆشکیان جوان دەکردو کوڕی زاناو شێخایەتیان دەڕازاندەوە .

ئەو کارتێکردنەی کە لە هاوڕێیەتی پڕسۆزو خۆشەویستی ئیمامدا لێی کراوە لەو ڕووداوەدا دەردەکەوێت کە سوڵتان جهانگیر خۆی بە فەخرو شانازییەوە دەیگێڕێتەوەو دەڵێ : ( لە ڕۆژی ٢٤ی مانگی (دی)[1] هاتینە دەرەوە بۆ سەیرانو گەڕان لە قەڵای (کانکرە)دا ، ئەمرمان کرد کە قازیو میر عەدلو چەند زانایەکی تر لە گەڵماندا بن ، بۆ ئاشکراکردنی دروشمەکانی ئاینی ئیسلامو ئەحکامەکانی شەریعەتی موحەممەدی ، بە کورتیەکەی پاش ڕۆیشتنی فەرسەخێك گەیشتینە سەر لوتکە قەڵاکە ، ئەمجا بە یارمەتی خوا ئەمرمان کرد کە بانگ بدەن، بانگ درا ، پاشان دوانێکم داو ئەمرم کرد کە مانگا سەر ببڕن ، لەو کاتەوەی ئەم قەڵایە دروست کراوە ئەمە ڕووی نەداوە ، ئەمجا چووم بە سوجدەدا بۆ خوای گەورە ، وا یارمەتی منی داوە بۆ کارێك تا ئێستا بۆ هیچ سوڵتانێك نەهاتۆتە دی ، پاشان ئەمرم کرد مزگەوتێکی گەورەو بەرزو فراوان لە ناو قەڵاکەدا دروست بکەن )[2] .

بەڵێ پاش ئەوەی ئیمام سەرهەندی تەمەنێکی دوورو درێژی بەسەر برد لە بانگەوازیو پەروەردەکردنو خزمەت کردنی ئاینو

(١) ڕێکەوتی سەرەتای ربیع الاول ١٠٣١ك دەکات .
(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو .

ڕوون کردنەوەی قورئان و سونەت و ، ئەو تۆوەی ڕواندی لەو زەویە ڕەق و تەقە ، چۆن بەهۆی تێکۆشانە ڕاست و ڕەوانەکەیەوە بەری گرت ، ئەو ڕێگایەی گرتبویە بەر ، بۆ چارەسەرکردنی خەڵکی نەخۆشی سەردەمەکەی تەنانەت سوڵتان و وەزیرو میرانیش لێ بێبەش نەکرد بوو ، هەموویانی وەکو نەخۆشێکی یەك کەوتە دەهاتە بەرچاوو بە یەك چاو سەیری دەکردن ، بەڵام هەریەکەیان ڕێگاو بۆچوونی تایبەتی خۆیان هەبوو لە کاتی چارەسەرکردنیاندا ، تا لە ئەنجامدا بە هەوڵێکی ڕاستەو خۆو ، ناڕاستەوخۆ توانی ڕووی وڵات بەرەو ئیسلام بگۆڕێ و ، بەرەو قورئان و سونەت ئاراستەی بکاتەوە ، ئەو وڵاتەی ئیسلامیان پشت گوێ خستبوو و ، لێی بێ ئاگا بوون ، بگرە دژایەتیشیان دەکرد ، کەچی ئەم تێکۆشانە نوێکاریەی ئیمام ، سەرتاپای هیندستانی بەرەو ئیسلام برد جگە لەوەی ڕێبازەکەی بە زۆربەی ناوچەکانی جیهانی ئیسلامیدا بلاو بۆوە . تا کار گەیشتە ئەوەی سوڵتانیش چارەسەر بکات و لەو نەخۆشیە ڕزگاری بکات و چاویلکەی تاریك لە چاوەکانی داگرێت و ڕووناکی ئیسلام بەدی بکات ، ئەمجا پڕ بە دڵ ئیسلامی خۆش بوێت ..

سەرەتای ئەم گۆڕانەش لە کۆتایی سەردەمی سوڵتان جیهانگیرەوە دەستی پێ کردو ، لق و چڵ و پۆپەکانی تا سەردەمی شاهـ جیهانیش درێژ بۆوە .

## سەردەمی سولتان شاه جیهان

سەردەمی سوڵتان غازی شاهـ جیهان ( ۱۰۰۰ ـ ۱۰۷۵ك ) بە ( صاحب القرن الثاني ) ناوی دەرکرد بوو چونکە هەزاری دووەم

لەگەڵ هەزاری یەکەم لە سەردەمی ئەودا بەیەك دەگەن ، سەردەمێکی پڕخێرو بەرەکەت بوو بەرە بەرە بەرەو چاك بوون دەچوو ، دەستەڵاتی لە ساڵی ١٠٣٦ ی‌ك دەستی پێ‌کرد بۆ ماوەی سی‌و یەك ساڵ بەردەوام بوو ، پاش وەفاتی ئیمام بە دوو ساڵ ، فەرمان ڕەوایی وڵاتی گرتە دەست ، گومانیش لەوەدا نیە هەمیشە ڕێزو شکۆی بۆ ئیمامی سەرهەندی بووەو بەگەورە تێی ڕوانیوە .

مێژوو نوسەکان هەموو یەك دەنگن لەسەر ئەوەی سوڵتان شاه جهان دەروون چاك بووەو ، ڕێزی شەریعەتی ئیسلامی لە دڵدا بووە ، زۆر حەزی لە دروست‌کردنی مزگەوت کردووە ، بە فەرزەکانی شەرع دەستگیر بووە ، پیاو چاکانو زانایانی لە خۆی نزیك دەکردەوەو پشتی پێ دەبەستن ، ئەو ئادابو نەریتە ڕەسمی یانەی لە سەردەمەکانی پێشودا داهێنرا بوون ، زۆربەیانی لابردو هەڵی گرت . . سیر ریجرد برن ، دەڵێ سوڵتان شاه جهان دەیویست عەقیدەی ئیسلام زیندوو بکاتەوە ، مێژو پێزی بۆ بگێڕێتەوە ، لە هەمان کاتدا دژی ئاینەکانی تر نەدەوەستا ، بەڵام پاش ئەوەی تەختی پاشایەتی کەوتە دەست ، سوجدەی درودی « التحیة » کە سوڵتان ئەکبەری باپیری دای هێنابوو هەڵگرت ، هەروەها بەکارهێنانی ڕۆژژمێری خوایی ( التقویم الالهي ) کە ئەکبەر دروستی کرد بوو ، لە ناو خەڵکیدا ڕەواجی پێ‌یەیدا کردبوو کۆتایی پێ هات ، فەرمانێکی گشتی ساڵی ١٠٦٤ ك دەرکرد ، بە قەدەغە کردنی ژنو ژنخوازی لە نێوان موسڵمانانو هندۆکەکان ، ئەم دەستورە لە پەنجابو کشمیردا بڵاوبوو بۆوەو کرابوو بە یاو )[1] .

---

(١) الامام السرهندي / ابو الحسن الندوي .

پاش تیمر بوونی چەند ساڵێك بەسەر مردنی ئیمامی سەرهەندیدا مەلیك ( ئورنك زیب عالمگیر ) لە دایك دەبێ ، بەسەر مەلیك ( دارا شكۆ ) دا زاڵ دەبێت ، چونكە ( دارا شكۆ ) زیاتر مەیلی بەلای ( وحدة الوجود ) دا بووەو ئاینی هیندۆكیەكانی خۆش ویستوە ، بۆیە ( عالمگیر ) شۆڕشێكی بەسەردا كردووەو لەسەر تەختی پاشایەتی لای دەبات ، عالمگیر برای داراشكۆ بووەو ، بە ئاسانی دەتوانێ بەسەریدا زاڵ بێت ، چونكە لە ڕەچەڵەكی پاشایەتیەو پشتگیرو لایەنگرانی زۆر بووەو زیاتر خۆشیان ویستوە ، ئەم پاشا لاوە پیاوێكی چاكو لە خواترس بووەو ، ئەمەش جێ دەستی ئیمامی سەرهەندی پێوەی دیارە ، لە كوڕەكانی ئیمامی سەرهەندیەوە بۆی ماوەتەوە ، چونكە بەهۆی ئەمانەوە پەروەردەیەكی عەمەلیو ڕەوشتی تەواو وەردەگرێتو دەیكاتە خزمەتكاری شەریعەت ، ئەم پاشا لاوە كوڕەزای مەلیك ئەكبەرە ، ئەو ئەكبەرە كە بووە هۆی ڕوخاندنی شەریعەت كەچی عالمگیری كوڕەزای سەرلەنوێ زیندوی دەكاتەوەو دروستی دەكاتەوەو لە هەموو نەزانیو كوێرەواریەك خاوێنی دەكاتەوە »[1] .

( ذكاء الله الدهلوي )ی مێژوو نوس دڵێ

( لە سەردەمی عالمگیردا ، ئەمر دەركرا هەركاتێ موسڵمانان چوونە لای سوڵتان ، هەر ئەوەندە پێویستە كە بڵێن ( السلام علیك ) ، پێویست ناكات دەستورو دابو نەریتی كافران بنوێنن ، هەروەهـا پێویستە لەسەر حاكمو میرانیش هەر هەمان دەستور بگرنە بەر لەگەڵ تایبەتمەندانو خەڵكانی تریشدا .

---

(١) موجز تاريخ تجديد الدين واحيائه / ابو الاعلى المودودي .

گۆڕانکاری تری زۆر کرد لە ڕژێمی وڵاتدا هەمووی بەسەرمو ئیسلام ئاراستەکردو شەریعەتی ئیسلامی سەر لە نوێ زیندوو کردەوە ، لە نەوەندەکانی ئاینـدا ، سوڵتان ( ئورنك زیب عالمگیر )یان ناو نابوو ( محي الدین ) یانی زیندوو کەرەوەی ئاین ، هەروەها دکتۆر ئیقبال ، سوڵتان عالمگیر دەخاتە ڕیزی ئەو کەمە ناودارانەی فەزڵیان زۆر بووە لە پارێزگاری کردنی ئاینو موسڵمانانو لەناو نەچوونو نەتواندنەوەیان لە ناو شارستانی هیندیەکاندا ٠

دکتۆر ئیقبال زۆر مەدحو سەنای نوێخوازی هەزاری دووەم ئیمامی سەرهەندیو ئیمام ولی الله الدهلویو سوڵتان ( محي الـدین ) عالمگیری کردووە ، دەڵێ : من هەمیشە وتومە ئەگەر بهاتایە ئەو کەسانەو تێکۆشانە سەرکەوتوانەکەیان نەبوایە ئەوا ئیسلام لەناو ئاینو شارستانی هیندیەکان دەمێك بوو تواوەوە )[1] ٠

**ابو الاعلى المودودي دەڵێ :**

جێ دەستی ئیمامی سەرهەندی هەر لەوەدا کۆنەبۆتەوە کە حکومەتی هیندستان لە بلوەتی کوفر دەرهێناو ، تەوژمی ئەو فیتنەیەی خوار کردەوە کە خەریك بوو ئیسلام لەم وڵاتانەدا پانو پلیش بکاتەوە، بەڵکو دوو شاکاری تری مەزنی کردووە :

یەکەمیان ئەوەیە سەرچاوەی تەصەوفی خاوێنی لە تێخنیو پیس پاك کردەوە کە لە ڕێی فەلسەفەو ڕەبەنیەتەوە خۆی کشاند بووە ناویەوە ، تەصەوفی ئیسلامی ڕەسەنی ڕاستەقینەی هێنایەوە کە ئایە

(١) الامام السرهندي / ابو الحسن الندوي ٠

دووەم سەرپێچی‌یەکی توندو تیژی کرد لە هەموو ئەو داب‌و نەریتـــە جاهیلەیەتانەی لە ناوخەڵکیدا ڕەواجی پەیدا کرد بوو، بە هـۆی نیزامی بەیعەت‌و ئیرشادەوە بزوتنەوەیەکی گەشە کردووی ژیانەوە بۆ شوێن کەوتنی شەریعەت ، بە هەزاران لە ئەندامانی مەشق پێ‌کراوو ڕاهێنراوی ئەم بزوتنەوەیە ، لـــە هەموو لایەکی هیندوستان‌و وڵاتانی ئاســـیای ناوەڕاست گەڕاون ، هەموو تواناى خۆیان خستۆتە کار بۆ چـاکردنی ڕەوشت‌و عەقیدەی خەڵـکی ، تا ئەوەیە ئەو شاکارو کردارە مەزنەی ، کە شێخ ئەحمەدی سەرهەندی لە پێناویدا بە نوێخوازی گـەلی ئیسلام دادەنرێ )(١) •

لە کۆتاییدا ، تێکۆشان‌و خەباتی دوو خەلیفە مەزنەکەی ئیـــمامی سەرهـــەندی‌و شێخ ( محمد معصوم )و شێخ ( السید آدم البوری )و چەندین خەلیفەی تـری خـودا نـاس‌و دڵسۆزی ئیمام بەری گرت‌و بەرهەمی خۆی بەخشی ، بەرە بەرە وڵات لە ماوەی دوو سەدەی یانزەو دوانزەدا بووە مەڵبەندێـکی فیکری‌و زانستی‌و ڕۆشنبیری • لە هـەموو لایەکی جیهانی ئیسلامی‌یەوە خەڵـکی بۆی دەهاتن‌و ڕوویان دەکردە هیندستان ، تا لە سـەرچاوە زانستی‌و ڕۆحی‌یەکەیەوە بابەتی خـــۆیان هەڵـگۆزن‌و بە پەروەردە ئاینی‌یەکەی پێ‌بگەن‌و بیابانی سلوك لەســـەر دەستی شێخەکـــانیان ببڕن‌و ، حەدیسی پیرۆز لـــــە ســـــەردەستی مامۆستایانی حـــــەدیس وەربـگرن ، لـە هەموو لایەکی ئــــەم وڵاتەدا مەڵبەندی تەریقەتی نوێـکراو ، مەڵبەندی زانستی دامەزرێنرا بوو بۆ فێربوونی قورئان‌و ناسینی ڕێبازی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دوورو نزیك سوودیان لەم مەڵبەندانە وەردەگرت •

---

(١) موجز تاريخ تجديد الدين واحيائه / ابو الاعلى المودودي •

## خەلیفەکانی ئیمامی سەرهەندی :

خەلیفە مەزنەکانی ئیمامی سەرهەندی هەروا بە ئاسانی باسکردنیان کۆتایی پێنایێت ، لە ڕاستیدا بەس بە تەنهـا خەلیفە پێگەیشتوو ، تێگەیشتووەکانی کـــە هەریەکەیان مامۆستایەکی سەربەخۆ بوون بۆ خۆیانو بەهەزاران قوتابیو مریدیان بووە ، ژمارەی ئەو خەلیفانە لـــە هەزار تێپەڕی کرد بوو ، بە هەموو لایەکی جیهاندا بڵاو بوو بوونەوەو ، ئاڵای بانگەوازیان هەڵگرتبوو ، بزوتنەوەکەی ئیمامیان بڵاودەکردەوە، ئیمام خۆی زۆربەیانی نارد بووە دەرەوەی وڵات بۆ پەروەردەکردنو بانگەوازیو ڕێنماییو ، هەندێکیشیانی لـــە ناوچە ســەرەکیەکانی هیندوستاندا دامەزراند بوو ، بۆ جێبەجێکردنی ئەم خزمەتە مەزنە ، ئێستاش بەناوبانگترینی ئەو خەلیفانە دەخەینە ڕوو .

(١) شیخ ( محمد معصوم السرهندي ) .
(٢) شیخ السید آدم النبوری .
(٣) شیخ احمـــد البرکی .
(٤) شیخ احمد الدیني .
(٥) شیخ أمـــان الله اللاهوري .
(٦) شیخ بدر الدین السرهندي .
(٧) شیخ بدیع الدین السهارنبوری .
(٨) شیخ حسن البرکي .
(٩) شیخ حمیـــد البنغالي .
(١٠) الحاج خضرخان الافغاني .
(١١) شیخ میر صغیر احمد الرومي .

(١٢) شيخ طاهر البدخشي ٠
(١٣) شيخ طاهر اللاهوري ٠
(١٤) شيخ خواجه عبيدالله المعروف بخواجه‌خان ٠
(١٥) شيخ خواجه عبدالله المعروف بخواجه خورد ٠
(١٦) شيخ عبدالحي الحصاري ٠
(١٧) شيخ عبدالواحد اللاهوري ٠
(١٨) شيخ عبدالهادي الفاروقي البدايوني ٠
(١٩) شيخ افرخ حسين الهروي ٠
(٢٠) شيخ قاسم علي ٠
(٢١) شيخ كريم الدين بابا حسن الأبدالي ٠
(٢٢) شيخ السيد محب الله المانكبوري ٠
(٢٣) شيخ محمد صادق الكابلي ٠
(٢٤) شيخ محمد صالح الكولابي ٠
(٢٥) شيخ محمد صديق الكشمي ٠
(٢٦) الشيخ مزمل ٠
(٢٧) شيخ الحافظ محمد اللاهوري ٠
(٢٨) شيخ نور محمد التبني ٠
(٢٩) شيخ يار محمد الجديد البدخشي الطالقاني ٠
(٣٠) شيخ يار محمد القديم ٠
(٣١) شيخ يوسف البركي ٠
(٣٢) شيخ يوسف السمرقندي ٠
(٣٣) شيخ مولانا خالد النقشبندي الرومي ٠

## نوسراوەکانی ئیمامی سەرهەندی :ـ

نوسراوو نامەکانی ئیمامی سەرهەندی زۆرنو زۆریەشیان بە فارسییە ناودارترینیانو بەسوودترینیان ئەو کۆمەڵە نامانەیە کە پێی دەوترێت ( مەکتوباتی ئیمامی ڕەبانی ) ئەو نوسراوە مەزترین جێدەستە زانستیو چاکەکاریو نوێکاریەکەیەتیو وێنەیەکی زیندوی هەستو سۆزیتیو هەر بەهۆی ئەمانەوەیە پلەو پایەی نوێکاریو چاکە کاری دەناسرێتەو کەیشتی بە پلەی ئیجتهادو پێشەوایەتی لە مەعریفەتی خواییو زانستیو پشتگیری کردنی لە قورئانو سوننەت دەزانرێت ، ئەم مەکتوباتانە پڕن لە لێکۆڵینەوەی بەرزو وردەکاریو جوانکاری ، کەم کەس دەیکاتێو بە دەستی دەهێنێت ئەوانیش زانا بلیمەتەو لێهاتوەکان وەریانگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبیو تورکی ، وەکو کتێبێکی دیراسی لە مەڵبەندە زانستیو ڕۆحیەکاندا دەخوێندرێت ، تلوەکو ئیمڕۆش کتێبێکی تەڕوو پاراوو نوێیە ، هەر دەڵێی ئەو نامانە ئیمڕۆ نوسراون ٠

ئەم کۆمەڵە نامانە لە سێ بەرگدا کۆکراونەتەوە زمارەیان دەگاتە ٥٣٦ نامە ، چەندین جار چاپ کراونەتەوەو تا ئێستاش هەر چاپ دەکرێنەوە ٠

ناوی هەندێك لە نامەکانی ٠

(١) اثبات النبوة ٠

(٢) رد الروافض بریتییە لە بەربەرچدانەوەی هەندێ لە زاناکانی شیعەی ئێران ٠

(٣) الرســـالة التهليلية •

(٤) شـــرح رباعيـات •

(٥) معـارف لدنيـــة •

(٦) المبـــدأ والمعـــاد •

(٧) مكاشفات عينيـــة •

لێرەدا وای بەباش دەزانم کە تۆزێك بە درێژی باسی مەولانا خالید بـکەم ، چونـکە کوردەو لە ناوچەی خۆماندا ژیاوەو دەورێـکی بالآی هەبووە لە خزمەت کردنی ئیـسلام بلاوکردنەوەی تەریقەتەکەی ئیـمامی سـەرهەندی •

## مەولانا خالیدی نەقشبەندی[١] :ــ

ناوی ( ضیاء الدین ) خالید کوڕی ئەحمەدی کوڕی حوسەینە لـە عشیرەتی جافی میکایلی‌یەو لە کوڕانی پیر میکایلی دەورانی‌یە[٢] •

سالی ١١٩٣ك لە ناحیەی قەرەداغی سەر بە پارێزگای سلێمانی لە دایك بووەو ، هەر لەوێ گەورە بووەو ، پاشان خراوەتە بەر خوێندن ، لە خوێندندا سەرکەوتوو بووەو لە هەمان کاتدا پێش کەوتووش بووە لەم خوێندنەیدا خەریـکی بـــە دەست هێنانی زانیاری‌یەکانی فیقهو

---

(١) هەرچەندە مەولانا خالید خەلیفەی ڕاستەوخۆی ئیـمام نەبووە ، بەلام باسی دەکەین چونکە هەر بەرهەمی ڕێبازەکەی ئیــــمام سەرهەندی خۆیەتی •

(٢) علمائنا في خدمة العلم والدين / عبدالكريم محمد المدرس •

زانستی عەقلیو نەقلی بووە ، خوێندنی لای زانا پایە بەرزەکان بووە ، وەکو سەید عبدالکریمی بەرزنجیو ، سەید عبدالرحیمی برای ، مەلای سالحی تەرەماریو ، ( صبغة الله الزیاری ) ، پاشان لای شێخ قسیمی سنەیی خوێندنی تەواو کردووەو گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی ، ماوەیەك لە مزگەوتی عەزیز ئاغای مەسرەفی لە ناو بازاڕدا ماوەتەوە ، ئەنجا چۆتە مزگەوتی عبدالرحمن پاشا کە ئێستا بە مزگەوتی بابا عەلی دەناسرێت ، ماوەیەك لەم مزگەوتەدا ماوەتەوەو زۆربەی زانایارییەکانی ئەو سەردەمەی بەدەرس وتۆتەوەو زۆریش سودیان لێ وەرگرتوە[1] .

پاشان چووە بۆ حەج ، لەم سەفەرەیدا بە شامدا تێپەڕیوەو چاوی بە زۆر لە زاناکانیان کەوتووە ، جا لە مەککەدا گەیشتوە بە چەند پیاوچاکێك مزدەیان داوەتێ بە ئاواتی خۆی دەگات ، ئەگەر ڕابەرێکی کاملی دەست بکەوێت بۆ خاوێن کردنەوەی دەروونیو پەروەردەکردنیو پێگەیاندنی ، پاشان گەڕایەوە بۆ شارە خنجیلانەکەی خۆیو هەر لە شوێنەکەی جارانی دەستی کردووە بە دەرس وتنەوە .

بەم شێوەیە مەولانا خالید مایەوە ، تا لە پڕ کلیلی دڵی داخراوی دەگاتە دەستو ئەو ئاواتو ناڵەیەی کە ماوەیەکی زۆرە دەیگرێنێو وێڵە بە شوێنیدا ئەوا پێی گەیشتو زەردەخەنەو پێکەنین سەر لێوەکانیو تەنانەت ناخو دڵیشی گرتەوە ، بەڵێ کلیلی ئەم دەرگایەو چاری ئەم دەردەی لای ئەو کەسە بوو ڕۆژێکیان دەگاتە لایو دەیناسێنێ بە سەید غولام عەلی عبداللەی دەلهی ڕابەری گەورەی نەقشبەندییەکان چونکە ئەم کابرایە خۆی سەر بەو سەید غولامە بوو . لەوکاتەشدا دەلهی پڕ

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو .

بوو لە ئەولیاو زاناو حەدیس ناسان ، ئەم کابرایە باسی چاکی‌و بەفەڕی ڕابەرەکەی خۆی لای مەولانا خالید باس دەکات تا ئەوەندە خرۆشاندی خۆی گەیاندە لای ، جا لەبەر ئەمە بوو مەولانا خالید لە سلێمانیەوە بەرەو دەلهی کەوتەڕێ ، هەر کە گەیشتە ئەوێ دەستی بــە تەریقەتەکەیەوە گرت ، ماوەیەك لــە لای دەمێنێتەوە ، پاشان بە ئیزنی ســـەید غولام دەگەڕێتەوە بۆ کوردوستان هەر کە گەیشتەوە ولآت خەلـکی بەگەرمـی پێشوازیان لێ کردو بە خۆشیەوە بە پیریەوە هـــاتن ، ماوەیەك لـــە سلێمانی دەمێنێتەوەو ئەمجا بەرەو بەغدا دەڕوات بۆ زیارەتی شـــێخی گەیلانی‌و لە تەکیەکەیدا شەش مانگ دەمێنێتەوە ، پاشـــان بۆ ڕێنمایی ڕێگرانی تەریقەت‌و فێرکردنی قوتابیان بۆ سلێمانی دەگەڕێتەوە ، ساڵی ١٢٢٦ك گەڕایەوە سلێمانی ئەمجارە لە سلێمانی بێزار دەکرێ‌و ســـەر لەنوێ بۆ بەغدا دەگەڕێتەوە ، لەو تەکیەیەدا ماوەتەوە کــە ئێستا بــە تەکیەی خالیدیە دەناسرێ ، هەر لەوێدا دەمێنێتەوە بۆ ڕێنمایی کردن‌و سودگەیاندن بە خەلـکی ، پاش ماوەیەك مەحمود پاشای میری بابان دێتــە لای‌و تکای لێ‌دەکا بگەڕێتەوە بۆ نیشتمانەکەی خۆی ، مـــەولانا بـــە قسەی دەکاو دەگەڕێتەوە ، مەحمود پاشا خانەقایەکی هـــەر بـــە ناوی خۆیەوە بۆ دروست کرد ، بەشەوو ڕۆژ خەریکی ڕێنمایی خەلکی بوو ، هەروا بە ئیرشادو دەرس وتەوە ماوەیەك خەریك بوو ، تا ئەمجارەیان بە تەواوەتی بێزارکراو ئیتر سلێمانی بۆ دوایـــن جـــار بەجێ‌هێشت ، گەڕایەوە بۆ بەغدا لە تەکیەکەی یەکەم جاریدا دانیشتەوە ، ئەش لە ساڵی ١٢٣٨ی‌ك دابوو .

جا لەم ماوەیەی کە لە بەغدا بووە ، مەلا عبدالرحمانی ڕۆژبەیانی دەچێتە خزمەتی مەولانا خالید ، ئەم دووانە هاوڕێیەتی کۆنی کاتی دەرس

خوێندن لە نێوانیاندا بووە ، زۆریش یەکتریان خۆشویستووە ، پێش ئەوەی مەولانا خالید بڕوات بۆهیندستان زۆر جار بەیەکەوە دانیشتوون ، جا لەو کاتی دانیشتەیاندا هەر بابەتێکی زانستی یان ئەدەبی بکرایەتەوە ئەوا هەر مەلا عبدالرحمن شۆڕە سوار بووەو تیایدا شارەزاتر بووە لـــە مەولانا خالید .. بەڵام سەردانی ئەمجارەیانی کـــە لە ساڵی ١٢٣٤ك ـ ١٨١٩زدا بوو زۆر جیاواز بووە لەوانی تر ، چونکە مـەلا عبدالرحمن شتی زۆر سەیری لە مەولانا خالید دەبیست ، دەبینی بـــە زاراوەی تەصەوفی وا قسـەی دەکرد کە نە مەلا عبدالرحمنو نە غەیری ئەویش ئەمانەیان نەبیستبوو ، بۆیـــە مـــەلا عبدالرحمنی ڕۆژ بەیانی زۆری خۆشویستو بوو بە یەکێك لە مریدەکانی . کاتێ کە ( داود پاشـــا ) بەمە دەزانێ دەچێتە لای مەلا عبدالرحمن ڕۆژ بەیانی پێی دەڵێ :ـ

من دەزانم کە مامۆستاکەم ـ مەبەستی مەلا عبدالرحمانە ـ لە هەموو زانستەکاندا لە خالیدو غەیری خالید زۆر شارەزاترو پایە بەرزترە ، هەر لەو کاتەوە کــە هەموویان پێکەوە قوتابی بوون ، ئیتر چۆن ئێستا مـــــل کەچی شێخ خالید بووەو بووە بە یەکێك لە مریدەکانی ؟!

مەلا ڕۆژبەیانی وەڵامی دەداتەوەو دەڵێ ئەوەی کە تۆدەیزانی لەمەوپێش ڕاستە وابوو ، بەڵام ئەم پیاوە چەند ساڵێك دیار نەما ، چـەند زانستو عیرفانێکی بەدەست هێناوە ئێمە لێی بێ ئاگاین ، منیش لـــــە بەردەم گەورەیی ئەو عیلمو عیرفانە ملم کـەچ کـردووە ، کاتــێ کە چوومە لای دیتم کانیەکە دوڕو گەوهەری عیلمی لێ هەڵ دەقوڵێ ، بۆیە لە بەردەمیدا سەرم دانەواندو و پێلاوەکەیم گرتە بەر[1] .

---

(١) گۆڤاری کاروان ژمارە ١٨ بەشی عەرەبیەکەی .

مەولانا خالید ، مەلا ڕۆژبەیانی لە جێگەی برای خۆی دانا بوو ، نەك وەکو مریدێك سەیری بکات لەبەر ئەو پەیوەندیە کۆنەی کە لە خوێندن لە نێوانیاندا هەبوو ، بە کورتی مەولانا خالیدو ئەحمەد حەیدەری‌و شێخ مزووری‌و شێخ ڕۆژبەیانی هەریەکەیان بۆ خۆی زانایەکی پایە بەرز بووە هەموویان پێکەوە لە ڕووی خۆشەویستی‌و ، زانست‌و فەزل‌و مافیان بەسەر یەکترەوە وەکو برایەك دەژیان ، بەڵام ئەوەندەیە مەولانا خالید بوو بە پێشەواو پێشڕەویان ، بە هۆی ئەو ویلایەتەوە بە دەستی هێنابوو لە تەصەوفدا ئەو کە لە پیاوانەش بەو پەڕی دڵ فراوانی‌یەوە گوێڕایەڵی ئەو بوون‌و مل کەچی بوو بوون[1] .

بەڕاستی ئەمەیە باشترین نموونەی بەرزی تەواضع‌و شوێن‌کەوتنی ڕاستی‌و زانست‌و حەق پەروەری ، ئەمەیە ئەو ڕەوشتە بەرزەی هەمیشە ئاینی ئیسلام دەیەوێ شوێن کەوتوانی خۆیانی پێ برازێنەوە لەهەمەر شوێنێکدا زانست‌و حیکمەت‌و ڕاستی دەست کەوت سەری بۆ دانەوێنن‌و شوێنی بکەوێت وەکو پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت :-

( الحكمة ضالة المؤمن أنى وجدها فهو احق بها ) .. بەڵێ ئەوەی لە نێوان ڕۆژبەیانی‌و مەولانا خالیدا ڕوویدا ڕۆحی ئیسلامەو بەرزترین ڕەوشتی ئەم ئاینە پیرۆزەیەو بانگەوازی بۆ دەکات .. خۆزگایە ئەم ڕەوشتە بەرزو نموونە جوانەی هەق‌و زانست پەروەریەش لە ناو ئاین پەروەرانی ئەم سەردەمەی خۆماندا ڕووی بدایەتەوەو بکرایە بە دەستورو باو .

پاش ساڵی ١٢٣٨ مەولانا خالید ڕۆیشت بۆ دیمەشقی شام ، هەر

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو .

لەوێدا بە مامۆستایەتی و ئیرشادەوە خەریك بوو ، خەڵکی لەوێ زۆریان سود لێ وەرگرت ، ئەمجا چوو بۆ زیارەتی قودس ، بۆ جاری دووەم زیارەتی پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم کردەوە ، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ شام و جەر لەوێ لە ساڵی ١٢٤٢ك وەفات دەکات و دەچێتەوە بۆ بارەگای جاویدانەو ئیتر دڵە پڕ لە تاسەکەی دادەمرکێتەوە و لێی دەحەسێتەوە ، لە کێوی ( قاسیون ) دەنێژرێت ، کوڕێك لە سکی خێزانەکەیدا بەجێی دەهێڵێت ناوی ( نجم الدین ) بوو لــە لای مامەکەی گــەورە دەکرێ پێ دەگەیێنرێ تا دەبێ بە مورشید ، لەم سەردەمەشدا بنەماڵەو نــەداڵیان هــەر مــاون •

## نوسراوەکانی مەولانا خالید :ــ

(١) تەعلیق لەســەر پەراوێزی ( الخیالي ) و ( علی سیالکوتی ) دەربارەی عیلمی کەلام ساڵی ١٣٠٧ك لە ئەستانە چاپکراوە •

(٢) العقد الجوهري في الفرق بین کسبی الماتریدی[1] والاشعري لەگەڵ شەرحەکەیدا چاپکراوە •

(٣) شەرحی (اطباق الذهب )ی جاراللەی زەمەخشەری بە فارسی •

(٤) شەرحی مەقاماتی حەریری تەواوی نەکردووە •

(٥) لەسەر کتێبی حەدیس بە ناوی ( جمع الفوائد مــن جامع الأصول وجمع الزوائد ، نوسینی محمد بن سلیمان المغربي ) پەراوێزی نوسیوە و ئەو حەدیسانەی کە ١٤ مەسنەوی هەیە تیایدا کۆی کردۆتەوە •

---

(١) ماتریدو ئەشعەری دوو ئیمامی ئەهلی سوننەن ئیختلافی جوزئی هەبووە لــە نێوانیاندا لەسەر جوزئی ئیختیاری مرۆڤ بەلام هەردووکیان لەحەقیقەتی قورئانو سوننەت لەچوونەتە دەرەوە بــە پێچەوانەی موعتەزیلەو جەبریەکان کە لەقورئانو سوننەت چوونە دەرەوە •

(٦) پەراوێزی لەسەر نهاية الرملي في الفقه الشافعي ) تا بەشی ( الجمعة ) لە دوو بەرگدا نوسیوە .

(٧) شەرحی عەقائدی عەضەدی کردووە .

(٨) ( رسالة في العبادات )ی نوسیوە .

لە کۆتاییدا دەمەوێ بڵێم :ـ

لە کوردەواریدا دوو سێ پیاوی ناوداری وەکو مەولانا خالیدمان هەیە شانازی پێوە دەکەین و دڵمانی پێ خۆش دەکەین ، کە پیاوێکی ئاوا چاکەخوازو نوێخواز بێت ، کەچی ئێمە لە جیاتی ئەوەی ڕێزیان لێ بگرین و شوێن ئامۆژگاریەکانیان بکەوین ، هەڵدەستین بوختانیان بۆ دەبیانەوە هەڵدەبەستین . کەچی نوسەرێك یان ڕۆشنبیرێك یان ئەدیب دۆستێکی کورد بە شانازیەوە باسی دەکات نەك لە ڕووی ئاینیەوە بەڵکو لەو ڕوانگەیەوە کە کوردەو بە میراتێکی کوردی و کەلەپورێکی ئەدەبی دادەنێت ، کەچی ئاین پەروەرێکی کورد دەبێ زۆر لەوە زیاتر شانازی پێوە بکات جا سۆفیەکانیش لەم سەرەوە لە مەدح کردنیدا ئەمەندە زیادە ڕەوی دەکەن لە سنوور دەردەچن لە هەمان کاتدا ئەفوانی تر کە سۆفی نین ئەمەندە بە خراپ باسی دەکەن بێ تامی دەکەن .. زیادە ڕەوی نە لە مەدحەدا بکرێت نە لە زەم کردنیشدا بکرێت .. بەڵکو پێویستە وەکو هەموو چاکەخوازو نوێخوازێکی جیهانی مافی خۆی بدرێتێ ، چونکە پیاوچاك ئەوەی وتویەتی و ئەوەی کردوویەتی دوو جۆرە هەندێکیان سەردەمین و بۆ ئەو سەردەمەی خۆی بووە با ئەوەیان بۆ ئەو کاتەی وتراوە بهێڵرێتەوە کە سودیان لێ وەرگرتووە ، هەندێکی تریشیان شەقڵێکی سەردەمی وەرناگرن بەڵکو بۆ هەموو کاتێك دەشێت با ئێمەش بتوانین بەرنامەی خۆمان لەسەر ئەوانەو ئەوەیشی لە سەردەمی

خۆماندا پێویستمان پێیەتی‌و پیلو چاکانی ئەم سەردەمە وتویانەو کردویانە، بە بەرنامەی خۆمانی لەسەر داب‌ڕێژین‌و سوودی لێ‌وەربگرین بۆ ژیانی هەردوو دنیا •

با بەیەکەوە ئەو وەسفەی ئەمین فەیضی بەگ دەربارەی مەولانا خالید وتویەتی بیخوێنینەوە چونکە ئەو نزیکتربووە لێیەوە وەك لە ئێمە:

## دەڵێ :

« شێخ لە هەموو عولومی ظاهیرەو باطنیەدا صاحیب ئیقتیدار بووە، هەر لەگەڵ تەدریس‌و ئیرشاد مەشغول بووە • شیعر نەظم کردنی نەکردووە بە مەسلەك بۆ خۆی • مەعە هاذا مەرتەبەی شاعیرێتی لە مەرتەبەی حافظو سەعدی زیاتر نەبێ کەمتر نییە •

دیوانی کە بە ئیرادەی سولطان عەبدولمەجید خان طەبع کراوە، ئەگەر تەدقیق بکرێ صدقی ئیفادی ئێمە مەعلوم دەبێ، ئەمما ئەوەندە هەیە شیعری کوردی کەم گوتووە، مەناقبی کەشف‌و کەراماتی زۆرە »(١) •

هەروەها ماملۆستا هەژاریش لە وەسفی مەولانا خالید دەڵێ :

فیداتم نیشتمان بۆ شارەزوورت
ڕووناکە شلم ئەستەمبوڵ بەنورت
کە سەر دەستەی هەموو مەستانە خالید
نەملەی باقی کوردوستانە خالید •

والحمد لله أولا وآخرا، وصلى الله على سيدنا محمد وآله وصحبه وأهل بيته ومن تبعهم باحسان الى يوم الدين •

---

(١) لەلجومەلی ئەدیبان لەمین فەیظی بەگە •

## سەرچاوەکان


(١) رجال الفكر والدعوة / الامام السرهندي / ابو الحسن الندوي ٠

(٢) جريدة طب وعلوم /م ـ العدد ٦٢٢٢ ـ السنة ١٩ ـ ثلاثاء / ٢٣ ايلول ١٩٨٦ ٠

(٣) الانسان ذلك المجهول / الكسيس كاريل ٠

(٤) الابداع وكيفية تربيته / الدكتور فاخر عاقل ٠

(٥) موجز تجديد الدين واحيائه / ابو الأعلى المودودي ٠

(٦) المعقول واللامعقول / دكتور زكي نجيب محمود ٠

(٧) المنجد / الطبعة الرابعة والعشرون ٠

(٨) الانفجار الكبير أو مولد الكون / اوميد شمشك / ترجمة اورخان محمد علي ٠

(٩) مثنوي جلال الدين الرومي / الجزء الأول / ترجمة وشرح ودراسة الدكتور محمد عبدالسلام كفافي ٠

(١٠) السياسة والفلسفة / براترالدرسل ٠

(١١) ئەنجومەنی ئەدیبان / ئەمین فەیضی بەگ ٠

(١٢) گۆڤاری کاروان / ژمارە ١٨ ـ بەشی عەرەبی ٠

(١٣) مجلة التربية الأسلامية / العدد الثاني عشر / السنة السابعة والعشرون ٠

(١٤) الصوفي الشهيد / المحامي بوتان جياووك ٠

(١٥) الأتصال للتغير الثقافي/هادي نعمان الهيتي/الموسوعة الصغيرة ٤٣

(١٦) حقائق الأيمان / بديع الزمان سعيد النورسي / ترجمة احسان قاسم الصالحي ٠

(١٧) علماؤنا في خدمة العلم والدين / عبدالكريم المدرس ٠

(١٨) ما القدر ؟! / محمد قرقنجي / ترجمة محمد عوني ٠

